

# فەلسەفەی دڵەڕاوکێ


هانس هەرلوف گرێلاند

وەرگێرانی

فەڕۆخ نیعمەتپوور



گوتار

# فەلسەفەی دڵەڕاوکێ

*هانس هەرلوف گرێلاند*

لە نۆرویژییەوە: فەڕۆخ نێعمەتپوور

**دەستپێک**

دڵەڕاوکێ، حاڵەتێکی رۆحی یاخود هەستێکە هەمووومان رەنگە بە بێ ئەوەی سەرنجی بدەینێ یاخود بیری لێبکەینەوە، ئەزموونی دەکەین. کاتێک لە دەرگایەک دەدەین یاخود ژمارە تەلەفۆنێک دەگرین، دڵمان خێراتر لێدەدا. یان کاتێک لە بەرزاییەوە دەڕوانین، هەست بە سەرگێژە دەکەین. هەڵبەت دڵەڕاوکێ دەتوانێ لایەنی تریشی هەبێ. بۆ وێنە وەک ترسی لەرادەبەدەر یاخود بەردەوامیی ئەو دۆخانەی دەتوانن مرۆڤ لە درێژەدانی ژیان بە شێوەی ئاسایی دەستەوەستان بکەن. دڵەڕاوکێ هەر بەو رادەیەی کە دەتوانێ رۆڵێکی دیار لە ژیانی

ڕۆژانەدا بگێڕێ، دەتوانێ بەشێکی گرینگ لە نەخۆشیی دەروونیش بێت. لای سیگمۆنە فرۆید (١٨٥٦ ـ ١٩٣٩)، دڵەڕاوکێ ڕۆڵێکی سەرەکی لە ئازارە دەروونییەکاندا دەبینێ، هەروەها ڕۆڵێک لە قۆناغە جیاکانی کار و تیۆری ئەودا. بەڵام سەیر ئەوەیە کە دڵەڕاوکێ وەک دیاردە و وەک وشە سەرنجی فیلسووفەکانیشی ڕاکێشاوە، بە جۆرێک لای هەندێکیان بووە بە تێمای سەرەکی.

ئەوەیکە دڵەڕاوکێ وەک تێمایەکی ڕۆژانە و حازر، دەتوانێ ئازاربەخش و ڕێگر بێت، پێویستیی جیاکردنەوەی دوو جۆر لە دڵەڕاوکێی هێناوەتە گۆڕێ، کە یەکیان دڵەڕاوکێی ئاسایییە (پێی دەگوترێ دڵەڕاوکێی وجوودی)، و ئەوی تریان ئەو جۆرە لە دڵەڕاوکێیە ئازار دەبەخشێ (ئازاری دڵەڕاوکێ). لە ڕاستیدا ئەم دووانە یەکجار لەیەکتر جیاوازن. وەها کە فیلسووفەکان بە دڵەڕاوکێی وجوودییەوە سەرقاڵن تا ئەوی تریان.

وەک دوواتر ڕوونی دەکەینەوە، دەبینین ئەمە زۆر ئاسان نیە. بۆ وێنە تیۆری فەلسەفی لەبابەت دڵەڕاوکێ هەروەها باسی ئازاری دڵەڕاوکێ یش دەکا کە لە ڕاستیدا دەچێتە خانەی نەخۆشییە دەروونییەکانەوە. بەڵام بەهەرحاڵ گرینگە جیاوازیی دابنێین لە نێوان ئەو دڵەڕاوکێیەی مرۆڤ باشە لەگەڵیا بژی (ڕەنگە هەندێ جاریش وەک شتێکی پۆزیتیڤ لێکی بدەینەوە)، وە ئەو دڵەڕاوکێیەی کە بۆ دەربازبوون لێی دەبێ یارمەتی وەربگرین. ئێمە لێرەدا باس لە دڵەڕاوکێی وجوودی واتە دڵەڕاوکێی باو دەکەین، هەرچەند باسی ئەوەیش دەکەین چلۆن 'ئازاری دڵەڕاوکێ'یش سەرهەڵدەدا.

**فێنۆمێنۆلۆژیای 'ئێدمۆند هوسرێل'**

بە دوو شێواز دەتوانین لە دڵەڕاوکێ وەک دیاردەیەکی دەروونی بکۆڵینەوە: یەکەمیان سەرنج بدەینە کارتێکەرییەکانی دڵەڕاوکێ لەسەر جەستە، دووهەمیان سەرنج بدەینە وەسفی خاوەن دڵەڕاوکێ لە ئەزموونە دەروونییەکانی خۆی. دڵەڕاوکێ وەک دیاردەیەکی دەروونی خۆی لە جیهانی ئەزموونە سۆبیەکتییەکاندا دەبینێتەوە.

کاتێک وەسفی دیاردە دەروونییەکان لەو روانگەیەوە دەکەین کە چلۆن کەسێک ئەزموونیان دەکا، لە مانایەکی کەمێک بەربڵاو و نادەقیق دا لە راستیدا باس لە خوێندنەوەیەکی فێنۆمێنۆلۆژیانە دەکەین. وشەی فێنۆمێنۆلۆژیا لە فەلسەفەی کۆنیش دا هاتووە، بۆ وێنە لای هیگل، بەڵام وەک میتۆدێکی زانستی لە لایەن 'ئێدمۆند هوسرێل' ەوە (١٨٥٩ ـ ١٩٣٨) دامەزراوە. لای ئەو، ئەوەی پێناسەی ئاگایی (وشیاری) دەکا ئامانجداریەتییە (واتە زەین، یان ئاگایی هەمیشە ئاراستەکراوە بەرەو شتێک). کە مەبەست لەمە، ئەو شتانە نیە 'وشیاری' لە ژیانی رۆژانەدا پێیەوە سەرقاڵە، بەڵکو لە مانایەکی ئەبستراکتدا مەبەست ئەوەیە وشیاری (یان ئاگایی) هەمیشە ئاراستەی شتێک کراوە واوەتر لە خۆی (یان لەدەرەوەی خۆی)، کە پێی دەگوترێ 'شتی ئامانجدارێتی وشیاری'. بە واتایەکی تر، ناوەڕۆکی وشیاری لە ناو خودی وشیاریدا نیە، بەڵکو لەدەرەوە، واتە لە جیهاندایە کە خۆی پیشانی وشیاری دەدا. وشیاری هەم هەست دەگرێتەوە و هەم وێنا، هەم ئەزموون و هەم خەیاڵ. لە رێگای هەستەوە، وشیاری لە جیهانی فیزیکی دەگا، بەڵام کاتێک ئێمە بیر دەکەینەوە یاخود خەیاڵ، شتەکان کە ئێمە وێنایان دەکەین بەشیک لە وشیاری نین، ئەگەرچی وشیارییە بەرهەمیان دێنێ. ئەوان تەنیا خۆ پیشانی وشیاری دەدەن. گەر بمانەوێ لە وشیاری بکۆڵینەوە، ناتوانین خودی وشیاری بکەین بە شت (ئۆبیەکت)، مەگەر ئەوەیکە شتەکانی ناوی بکەین بە بابەتی لێکۆڵینەوە. هەر بۆیە لێرەوە فێنۆمێنۆلۆژی داهێنراوە. لە لایەکی ترەوە فێنۆمێنۆلۆژی سەرقاڵی ئەزموونە رێکەوتەکان و دیاردە دابڕاوەکان نیە، بەڵکو خۆی بە جەوهەر یاخود لایەنە بنەڕەتییەکانی دیاردەکانەوە (فێنۆمێن)، سەرقاڵ دەکا. کە لێرەدا، لەم وتارەدا، دڵەڕاوکێ (Angst) ئەو دیاردەیەیە ئێمە دەمانەوێ باسی لێبکەین. دوو بیرمەندی وەک مارتین هایدگر و ژان پۆل سارتێر، کە دوواتر زیاتر باسیان دەکەین، تیۆری خۆیان لە سەر فێنۆمێنۆلۆژیای هوسرڵ دادەڕێژن. لێکۆلینەوەکانی 'سۆرن شیرکەگارد'یش لەسەر دڵەڕاوکێ، کە پێش هوسرل ژیاوە، دەتوانین وەک نموونەیەکی تر لە لێکۆڵینەوەی فێنۆمێنۆلۆژی چاولێبکەین.

لە نێوان فێنۆمێنۆلۆگەکان و فیزیکالیستەکاندا کێبەرکێیەک هەیە سەبارەت بەوەی کامیان خاوەن تیۆرێکی باشترن. هەر کامەیان نوێنەری ئۆنتۆلۆگی تایبەتی خۆیانن، واتە هەر کامیان خاوەن زانیاری خۆیەتی سەبارەت بە 'بوون'ی راستەقینە، یاخود راستیی راستەقینەی 'بوون'. ئۆنتۆلۆژیی فیزیکالیستەکان باس لەوە دەکا کە بنەڕەتی ترین راستیی مرۆڤ ئەوەیە مرۆڤ بریتییە لە سیستمێکی فیزیکی، وەها کە مێشکی فیزیکیی مرۆڤ، وشیاری (وەک تایبەتمەندیی دووهەم) بەرهەم دێنێ. لە کاتێکدا ئۆنتۆلۆژیی فێنۆمێنۆلۆژیا لەسەر ئەو رایەیە کە وشیاری لە پەلەی یەکەمدا دێت و هەموو وێناکان، دەستەواژەکان، هەروەها تیۆر لەسەر شتە فیزیکییەکان (بە جەستە و مێشکەوە)، جۆرێک لە بەسیستمکردنە کە وشیاری دەیکا و بۆیە هی جیهانی فێنۆمێنولۆژیایە.

ئەو سەرنجانەی (دیتن) کە دەبنە وەسفێکی فێنۆمێنۆلۆژیانە لە دڵەراوکێ، لە لایەن ئەو کەسەوە ئەنجام دەدرێ کە بە تووش دڵەڕاوکێوە بووە. بەڵام کاتێک قسە لەسەر دڵەڕاوکێیەکە کە دەبێتە هۆی کاردانەوەی فیزیکی، ئەوا لە لایەن ئەو کەسەوە وەسف دەکرێ وا وەک چاودێرێک لە دەرەوەی کەسەکە ئاگای لێیە. واتە کەسێک کە جەستەکە لە رووی دەرەوە دەبینێ. هەڵبەت لە هەر دوو حاڵەتەکەدا قسە لەسەر ئەو حاڵەتەیە وشیاری ئەزموونی دەکا. جەستەی ئەوی دی، بریتیە لە دیاردەیەک (فێنۆمێن) بۆ ئەو کەسەی سەرنجی دەدا و دەیەوێ تیۆری لەسەر سازبکا.

دەتوانین بڵێین ئەنتۆلۆگیای فیزیکالیستی بە گوێرەی مێتۆدی فێنۆمێنۆلۆژیکی کاردەکا، چونکە کەسێکی وا نایەوێ ئەوە رەدبکاتەوە کە ئەزموونە وشیارییەکان وجوودیان نیە. یان فێنۆمێنۆلۆژێکی ئۆنتولۆژیست کار دەکا لەسەر ئەو کاردانەوە فیزیکییانەی لە لایەن مرۆڤێکەوە پیشان دەدرێ، چونکە فێنۆمێنۆلۆگ کاردانەوە فیزیکییەکان رەد ناکاتەوە و پێی وایە ئەوانیش هەن و دەبێ وەک هەموو فێنۆمێنەکانی تر لێیان بکۆڵرێتەوە.

خاڵی سێهەم سەبارەت بەم باسە خۆی لە راوبۆچوونەکانی 'نیلس بوهێر' (١٨٨٥ ـ ١٩٦٢) دا دەبینێتەوە بە ناوی 'دەستەواژەی تەکمیلی'. بوهێر، لەم دەستەواژەیە کەڵک وەردەگرێ بۆ

ئەوەی لە فیزیکی کوانتۆمی بگا. لای ئەم بیرمەندە مرۆڤ کاتێک دەیەوێ فێنۆمێنێکی وەک دڵەڕاوکێ ئەزموون بکا، یاخود سەرنجی بدا، لە دوو شێوە کەڵک وەردەگرێ، یەکەمیان راستەخۆ ئەزموونکردنی دڵەڕاوکێیە و، دووهەمیان ئەزموونی دڵەڕاوکێیە لە رێگای سەرنجدانی کارتێکەرییەکانی لەسەر جەستە. کە ئەم شێوازە لە دیتن و سەرنجدان بە تەواوی لەیەکتر جودان و ئەو وەسفانەی پێشکەشی دەکەن ناکرێ لەگەڵ یەکتر بەراوردبکرێن. ئەوان نەک تەنیا لەگەڵ یەکتر بەراوردناکرێن، بەڵکو رەنگە دژبەیەکیش بن. بەلام هەردووکیان وەک یەک راستن. هیچ کامیان لەی تر گرینگتر نین و هەردووکیان پێکەوە دەتوانن وەسفێکی پێویستمان لە دڵەڕاوکێ پێدەدەن. واتە تەواوکەری یەکترن.

مرۆڤ هەروەها لە سەر تیۆری ناسین لە دەروونناسیشدا قسەدەکا. تیۆری ناسین لەسەر دڵەڕاوکێ، لە ئەزموونەکانی ئەو کەسەوە دەست پێدەکا وا بە تووش دڵەڕاوکێ بووە، کە هەر بەم هۆیەوە زۆر شتی هاوبەشی لەگەڵ فێنۆمێنۆلۆگی هەیە. جیاوازییەک کە هەیە ئەوەیە ئەم تیۆرە لەسەر بۆچوونەکانی هوسرێل لەمەڕ پێوەندی نێوان وشیاری و دیاردە خۆی چێ ناکا و هەربۆیە لە هەندێ دەستەواژەی کەمێک جودا کەڵک وەردەگرێ.

فێنۆمێنۆلۆژی خۆی لە ناو زانستە 'نەرم'ەکانی وەک دەروونناسی، پێداگۆگی یاخود زانستە مرۆییەکاندا دەبینێتەوە، بەڵام فیزیکالیزم خۆی لە ناو بیۆلۆژی دا، هەروەها لەو بەشەی بیۆلۆژی دا کە باس لە کرداری مرۆڤ دەکا. ئەمە ئەو بۆچوونەی دروست کردووە کە فێنۆمێنۆلۆژیا زیاتر سۆبیەکتیڤییە و خاوەن میتۆدێکی زۆر مەحکەم نیە، بۆیە ناکرێ لە زانستی سروشت دا کەڵکی لێوەبگرین. بەڵام میتۆدی فێنۆمێنۆلۆژی لە لایەن هوسرێلەوە لەسەر بابەتەکانی زانستی سروشتی ش بەکارهێنراوە، بە تایبەت لە سنووری نێوان ماتماتیک و فیزیک، وەک چۆن لە کارە پێشینەکانی دا لە بواری فەلسەفەی محاسباتی و هەروەها هیندەسەدا کەڵکی لێوەرگرتووە. بە واتایەکی تر، هوسرێل فێنۆمێنۆلۆژی بەکارهێناوە بۆ خوێندنەوەی ئەو دەزگا وشەییەی فیزیکالیستەکان کەڵکی لێوەردەگرن. هەروەها سارتەر لە ئۆنتۆلۆژیی فێنۆمێنۆلۆژیاکەیدا، فیزیک و بیۆلۆژیشی تێهاویشتووە.

خاڵێک کە لێرەدا دەبێ سەرنجی بدەینێ ئەوەیە کە هایدگر و سارتەر لێرەدا لە هوسرێل جودا دەبنەوە و دەست دەکەن بە رەخنە گرتن لەم بیرمەندە. واتە هایدگر و سارتەر تێگەیشتنی جودایان لە 'من' هەیە. هوسرێل پێی وابوو کە لە پشت وشیاری 'من' ێکی ترانسێندێنتاڵ (واتە منێکی بان سروشتی) هەیە. منێک کە بەشێک لە جیهانی فێنۆمێنەکان نیە، هەربۆیە وەسفکردنی مەحاڵە. بۆیە لێرەدا بە گشتی پرسیارێک لە سەر فێنۆمێنۆلۆژیا دێتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیکە کە داخۆ ئەم تیۆرە جێگایەکی بۆ 'من' لە ناو خۆیدا کردووەتەوە؟ هایدگر خۆی لە 'من' دەپارێزێ و شوێنێکی بێکردە (خنثی) دەبەخشێ بە سوبیەکت کە ناوی ناوە "Dasein"، واتە وجود. سارتەر بەڵام نایەوێ خۆی لە ئایدیای 'من' ببوێرێ و وەک وێنا یاخود تەسورێکی رووت لێی دەڕوانێ، ئوبیەکتێکی خەیاڵی کە 'وشیاری' دروستی کردووە بۆ ئەوەی ناسنامەیەک بە خۆی بدا. ئەمە مانایەکی گەورەی هەیە لەسەر تیۆری دڵەڕاوکێ، کە دوواتر دەچینەوە سەری.

'سۆرن شیرکەگۆرد' ی (١٨١٣ ـ ١٨٥٥) دانمارکی، یەکەم فیلسووف بوو دڵەڕاوکێی وەک تێما خستە بەر باس. ئەم فیلسووفە لە ساڵی ١٨٤٤ کتێبی 'دەستەواژەی دڵەڕاوکێ' ی دایە دەرەوە. ماوەیەکی درێژی خایاند تاکو ئەم کارە لە دونیای فەلسەفەدا خۆی ببینێتەوە. لە بیستەکانی سەدەی بیستەم دا ئەمە رووی دا کاتێک مارتین هایدگر (١٨٨٩ ـ ١٩٧٦)، باسەکەی شیرکەگۆردی هەڵگرتەوە و کردی بە باسێک لە فەلسەفەی ئەبستراکت دا لەسەر وجودی مرۆڤ و بەتایبەت لە سەر فێنۆمێنی 'هیچیەتی'. لە سییەکان و چلەکانی هەمان سەدەدا بەرهەمەکانی شیرکەگۆرد و هایدگر لەلایەن سارتەرەوە (١٩٠٥ ـ ١٩٨١) خوێندرانەوە و ئەم فیلسووفە سێنتێزێکی لەم دووانە پێشکەش کرد. لەکاتێکدا کارەکانی هایدگر یەکجار ئەبستراکتن و رەنگە هەڵێنجانی مانای کۆنکرێت لێی دژوار بێت، ئەوا دەقەکانی شیرکەگۆرد و سارتەر پڕی ئەو نموونانەن کە تیۆرە ئەبستراکتەکان بە شێوەی کۆنکرێت و دیاریکراو روون دەکەنەوە.

لە دووای سارتەر فیلسووفێکی وەهامان نیە کە بەو شێوە جیددییە خۆی بە دڵەڕاوکێوە مەشغوڵ کردبێ (تا ئەو جێگایەی من دەزانم). زۆر لە دەروونناسان و پزیشکانی دەروون هەوڵیان داوە لەم فیلسووفانە لە بواری خۆیاندا کەڵک وەربگرن. هەروەها دەبێ تەئکید لەسەر ئەوە بکرێتەوە بۆ وێنە سارتەر و فرۆید خاڵی هاوبەشیان سەبارەت بە لێکدانەوەی دڵەڕاوکێ هەیە. وا نایەتە بەرچاو ئەم فیلسووفانە جیاوازیی لە نێوان کاری خۆیان و دەروونناسی دا دەبینن. دڵەراوکێ ژێرنووسێکی هەیە بە ناوی "لێکدانەوەیەکی سادەی ئاراستەکراو بەرەو دەروونناسی". سارتەر حەز دەکا بە فەلسەفەکەی خۆی جێگرێک بۆ فرۆید بدۆزێتەوە، وە لە بەرهەمە فەلسەفییەکەیدا بە ناوی 'بوون و نەبوون' وەسفێک لەسەر ئەو شتەی بدا وا ناوی ناوە 'رەوانکاویی وجوودی'.

سەبارەت بە دڵەڕاوکێ ژمارەیەک بەرهەممان هەیە دەتوانین کەڵکیان لێوەربگرین، کە لەوانە دەتوانین ئاماژە بە بەرهەمەکانی شیرکەگۆرد، مارتین هایدگر و ژان پۆل سارتەر بکەین.

لەم دەقەدا بە پەلە کەڵکمان لە دەستەواژەکانی 'وجودی'، فەلسەفەی وجود' و 'وجودییەت'مان وەرگرت کە لێرەدا پێش ئەوەی زیاتر لە باسەکەماندا بڕۆینە پیشێ، دەبێ روونیان بکەینەوە. وشەگەلی وەک وجوود و وجوودییەت گەلێک جار لە لایەن شیرکەگۆردەوە کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ، کە دەگوترێ دەگەڕێتەوە بۆ گوتەیەک لە لایەن خودی ئەم فیلسووفەوە. ئەوەیکە شاعیری نۆروێژی 'یوهان سباستیان وێلهاڤێن' (١٨٠٧ ـ ١٨٧٣)، فەلسەفەی شیرکەگۆردی وەک وجوودییەت پێناسە کرد و شیرکەگۆردیش ئەمەی قۆستەوە. مەبەستی ئەم شاعیرە لەمە ئەوەیە کە وجوودییەت نزیکە لە ژیان و ئەو پرسیارانە دێنێتە گۆڕێ وا بۆ ژیان خاوەن مانان (واتە بۆ هەبوون)، کە بە پیچەوانەی فەلسەفەی ئەبستراکت و بەدوور لە ئەزموونە کە خۆی لە قەرەی ئەم باسە نادا. شیرکەگۆرد ئەم وشەیەی پێ خۆش بوو و کەڵکی لێوەردەگرت. مەبەستی شیرکەگۆرد لە وجوود تەنیا ئەوە نیە شتێک هەیە، وجوودێک کە دەتوانین سەبارەت بە هەبوونی بەرد و درەختیش بەکاری بێنین، مەبەستی ئەو خەسڵەتێکی تایبەتە پێوەندیدار بە وجوودی مرۆڤەوە. بۆیە ئەو دیاردەیەکی داهێنا کە تا هەنووکەیش باسی

لێدەکرێ. دەستەواژەی فەلسەفەی وجوود، گوتەیەکی تا رادەیەک ناڕوونە لە نەریتێکی فەلسەفیدا کە تا ئاستێک لەسەر شیرکەگۆرد و فینۆمێنۆلۆژیای هوسرێل بونیادنراوە. هەندێ فیلسووفی بەناوبانگی وجوودیی تریش هەن بە ناوەکانی هایدگەر، گابریەل مارسێل، کارل یاسپێرس، سیمۆن دێبوڤار، ئالبەرت کامۆ و ماوریس مالوپۆنتی. هەندێ جار فیلسووفی نۆروێژی 'پێتێر ویسێل زافە'یش گرێدەدەنەوە بەم نەریتە فەلسەفییەوە.

دەستەواژەی وجوودگەرایی تا رادەیەکی زۆر دەبەسترێتەوە بە سارتەر و دەورووبەرەکەی، لە پێش هەمووان‌دا دێبوڤار. سەرەتا سارتەر رازی نەبوو بەم ناوە، بەڵام بەرەبەرە قبوڵی کرد و بۆخۆیشی بەکاری هێنا سەبارەت بە فەلسەفەکەی خۆی. بۆ وێنە لە کۆڕە بە ناوبانگەکەیدا بە ناوی 'وجوودگەرایی مرۆڤگەراییە' کە دوواتر بە شێوازی کتێبیش چاپ کرا. وجوودگەرایی لە دووای شەڕی دووهەمی جیهانی مودێکی گەورەی فەلسەفی بوو، پێش ئەوەی لە لایەن فەلسەفەکانی تری وەک سترۆکتۆرالیسم، پۆست سترۆکتۆرالیسم و دژەسترۆکتۆر بدرێتە بەر رەخنەوە و جێی پێ تەنگ بکرێ. ئەمرۆکە سارتەر و فیلسووفە وجوودگەراکانی تر دەخوێندرێن، هەڵبەت بە پێچەوانەی دۆخی دووای شەڕ بە چاوێکی رەخنەیی. هەربۆیە هەنووکە زیاتر بۆمان روون بووەتەوە کە ئەم فیلسووفانە تا چ رادەیەک توانیویانە لە بوارەکانی فەلسەفە، زانست و دەروونناسی بەشداری بکەن. هەر لەوکاتەدا دەبێ ئاماژە بەوە بدەین لە سەرتاسەری جیهان، سەرنج بەرەو سەرچاوە فەلسەفییەکانی وجوودگەرایی، هوسرێل و شیرکەگۆرد بە رادەیەکی یەکجار زۆر زیادیان کردووە.

خۆیلەخۆیدا وشەی دڵەڕاوکێ سەرنجڕاکێشە. شیرکەگۆرد بە دەستەواژەکردنی دڵەڕاوکێ، لە دووای سەردەمی زاڵبوونی بیری هیگڵ، بووە هۆی ئەوەی دڵەڕاوکێ ببێ بە تێمایەک بۆ لێکدانەوەی ئەقڵی و رۆشنبیری. دڵەڕاوکێ چیتر سەر بە جیهانی ناڕوون، نائەقڵانی و هەستیارەتییەوە نیە، بەڵکو مانایەکە دەکرێ لێی بکۆڵرێتەوە. ئەم خاڵە بەرجەستەتر بووەوە بەوەیکە شیرکەگۆرد دەیویست ئەو تایتلەی بەکاری دێنێ ناوی بنێ 'سەبارەت بە دەستەواژەی دڵەڕاوکێ'، لە هاوئاراستەیی لە گەڵ تێزەکەی 'سەبارەت بە دەستەواژەی تەنز'. بەڵام

زۆربەی کارە فەلسەفییەکانی شیرکەگۆرد بە ناوی خوازراوەوەیە، ئیمە ئەوە دەزانین کە 'دەستەواژەی دڵەڕاوکێ' بیری لیکرابووەوە لە ژێر ناوێکا بدرێتە دەر هەم ناو بێت و ئەم ئاکادێمیک: واتە لە ژێر ناوی مامۆستای زانکۆ سۆرن شیرکەگۆرد. تەنیا بە مەودایەکی کەم، واتە چەند رۆژێک پێش ئەوەی کتێبەکە لە چاپخانە بێتە دەرێ، شیرکەگۆرد رای گۆڕی و بە ناوی 'ڤیگیلوس هاوفنیەنسیس' چاپی کرد کە بە کۆپێنهاگیی وشیار بەناوبانگ بوو. ئەم راگۆڕینە کتوپڕییە بووە هۆی کۆمەڵێک رووداوی سەیروسەمەرە. بۆ وێنە بووە هۆی بەناوبانگ کردنی پرۆفیسۆری کۆچکردوو 'پاول مارتین مۆلێر' کە مامۆستای شیرکەگۆرد بوو و نەک بەناوباگکردنی هاوفنیەنسیس، یاخود لە لایەن خودی شیرکەگۆر یان هاوفنیەنسیسەوە قەت روونکردنەوەیەک بۆ بەرلین بەرێنەکرا.

کتێبەکە بە رواڵەت زۆر بە شێوەیەکی سیستماتیک رۆنراوە بە پاژ و ژێرپاژەوە، بەڵام ناوەڕۆکەکەی ئەوەندە جۆراوجۆر و دژوارە کە هەندی لێکۆڵەر پێیان وایە واباشە وەک بەرهەمێکی تەنزئاسا بخوێنرێتەوە هەتا کاتێکی جددی. بەڵگەیەکی گرینگ لە دژی ئەم جۆرە تێگەیشتنە ئەو راپۆرتانەیە کە شیرکەگۆرد بۆخۆی دەماندات‌ێ، کە تێیاندا یەکەمین یادداشتەکان سەبارەت بەو تیۆرە دەبینین ئەو سەبارەت بە کتێبی 'دەستەواژەی دڵەڕاوکێ' پێشکەشیان دەکا. لەم یادداشتانەدا کلیلی تێگەیشتن لە بەرهەمەکەی دەکەوێتە دەستمان. بەهەرحاڵ ئەم بەرهەمە لەچاو ئەو بەرهەمانەی تر کە تا ئەو کات لەسەر دڵەڕاوکێ نووسرابوون یەکجار دژوارتر، ئاڵۆزتر، جۆراوجۆرتر و چەندماناترە، بەڵام لە هەمان کاتدا لە باری ئایدیاوە دەوڵەمەندتر. هەربۆیە ئەمە دەلیلێکی باشە بۆ ئەوەی بڵێین کتێبی 'دەستەواژەی دڵەڕاوکێ' هێشتا بە تەواوی لێی نەکۆڵراوەتەوە و دەتوانێ لەوەی هەتا ئیستاکە سەبارەت بە مانا و سترۆکتۆری ئەم وشەیە تێگەیشتووین، زیاترمان فێربکا.

تیۆری شیرکەگۆرد لەسەر دڵەڕاوکێ بە هەوڵێک دەست پێدەکا بۆ تێگەیشتن یاخود لێکدانەوەی دەستەواژەی 'گوناهی یەکەم' کە سەرچاوەکەی لە ئادەم و حەواوەیە و بە گوێرەی ئەم چیرۆکە هەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوە. بەو شێوازەی شیرکەگۆرد دەیبینێ، گوناهی یەکەم

تەنیا یەک جار رووی نەداوە، بەڵکو رووداوێکە کە لەگەڵ هەر مرۆڤێکدا روودەداتەوە. بە گوێرەی لێکدانەوەی ئەو، تەنیا بەم شێوەیە ئادەم وەک یەکەم مرۆڤ هەمان دۆخ لەگەڵ مرۆڤەکانی تر دابەش دەکاتەوە. بەڵام گوناهی یەکەم دیاردەیەکە سەروکاری لەگەڵ توانای 'هەڵبژاردن' هەیە و هەر بۆیە دەبەسترێتەوە بە ئازادی و جا ئەمە مرۆڤ رووبەڕووی ئەو دەرفەتانە دەکاتەوە کە هەم خەتەرە و هەم لە هەمان کاتدا ترسناک و سەرنجڕاکێش. (مەبەست لە ئازادی لێرەدا، ئازادی دەرەکی نیە، وەک ئازادیی سیاسی، بەڵکو ئازادیی وجوودییە کە سەرەڕای چۆنیەتی دۆخە دەرەکییەکان هەمیشە لەگەڵمانە).

دڵەڕاوکێ پەیوەندی بە ئازادییەوە هەیە، بەڵام هاوکات لە گەڵ ئەو بێ هێزییەی کە ئازادی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ، بێ هێزییەک کە دیسان دەبەسترێتەوە بە ناڕوونیی دەستەواژەی ئازادی. شیرکەگۆرد ئەم بێ هێزییە دەبەستێتەوە بەو دەرفەتەی کە دەتوانێ مرۆڤ بەرەو خەڵەتاندن ببات. جا یا ئەو خەڵەتاندنە بێت لە داستانی ئادەم و حەوادا (کە مرۆڤ لە لایەن مارەوە دەخەڵەتێندرێ)، یان ئەو خەڵەتاندنەی شیرکەگۆرد لە پاژی 'رۆژانەی خەڵەتینەر' لە کتێبی 'یان ئەم یان ئەو' باسی لێدەکا. چونکە ئێمە لە لایەن شتێکەوە دەخەلەتێندرێین کە هەم ترسناکە، هەم دڵەڕاوکێ دێنی و هەم هەستی بی هیزی لە ئێمەدا بەرهەم دێنی، وەها کە ئەمانە پێکەوە دەرفەتی خەڵەتاندنی ئێمە فەراهەم دەکەن. لەم هەست بە بێ هێزی کردنەدایە گوناهی یەکەم وەک میرات بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە.

دڵەڕاوکێ، خۆی وەک وشیارییەکی روون لە ئازادیی وجوودیدا پیشان نادا، بەڵکو وەک تەسەورێکی ناروون لە خەونێکی بێ گۆناحدا خۆی نیشان دەدا پێش ئەوەی مرۆڤ بەخەبەر بێتەوە و وشیاری لەسەر ئازادی و توانای هەڵبژاردن و بەرپرسایەتی تێیدا بە جوانی تێیدا چەکەرە بکا. هەربۆیە دڵەڕاوکێ ئەو هەستەیە کە ئاماژە بە ئازادی دەکا پێش ئەوەی ئازادی لە لایەن مرۆڤەوە هەستی پێبکرێ، کە رەنگە قەتیش ئەم هەست پێکردنە سەرنەگرێ.

پاراگرافی سەرەکی لەمەڕ دڵەڕاوکێ لەوبەشەدایە کە لە ژێر ناوی 'دەستەواژەی دڵەڕاوکێ' لە کتێبەکەدا باسی لێدەکرێ. لەم بەشەدا نووسەر باس لە جیاوازیی گرینگی نێوان دڵەڕاوکێ و

ترس دەکا کە تێیدا ترس بریتییە لە ترس لە شتێک، واتە ترس خاوەن شتە، لە کاتێکدا دڵەڕاوکێ خاوەن شت نیە. یان وەک شیرکەگۆرد دوواتر باسی دەکا 'شتی دڵەڕاوکێ بریتییە لە **هیچ.**

باسی 'هیچ' دوواتر لە لایەن هایدگەر و سارترەوە دەبێتە باسێکی گرینگ. شیرکەگۆردیش لە کتێبەکەیدا پیشانی دەدا کە چلۆن مرۆڤ لە دۆخی سروشتی دا کە دۆخێکی بێ گوناهیە و هێشتا مرۆڤ بیری لە خۆی نەکردووەتەوە، هەست بە نائارامییەک لەخۆیدا دەکا کە رێک هەمان دڵەڕاوکێیە. ئەو دەنووسێ:

"لەم دۆخەدا (دۆخی سروشتی) ئارامی و حەسانەوە هەیە، بەڵام لەهەمان کاتدا شتێکی تریش کە نائارامی و کێشەیە، لەبەر ئەوەی هیچ شتێک نیە لە گەڵیا بە کێشە بێت. ئەمە چییە؟ هیچ. بەلام هیچ چ کاریگەرییەکی هەیە؟ دڵەڕاوکێی لێ لەدایک دەبێ. ئەمە رازی قووڵی بێگوناهییە، کە لەهەمان کاتدا بریتییە لە دڵەڕاوکێ. رۆح لە خەون بینینی خۆیدا حەقیقەتی خۆی بەرهەم دێنێ، بەڵام ئەم حەقیقەتە بریتییە لە هیچ، بەلام لە هەمان کاتدا ئەم هیچە بەردەوام لە دەرەوەی خۆی بێگوناهی دەبینێ."

**دڵەڕاوکێ لای سۆرن شیرکەگۆرد**

قسەی لەم چەشنە کە خۆی لە قەرەی کایە بە وشەی 'هیچ' دەدا. لە لایەکەوە 'هیچ' بە مانای ئەوە دێ 'شتێک لە ئارادا نیە' و، بەڵام لە فۆڕمی زمانی دا وەک دیاردەیەک دێتە گوێ کە بوونی هەیە (سوبستانس). دەبێ ئەوە بڵێین شیرکەگۆرد لێرەدا کایە بە وشە دەکا. ئەو، زمان لە رێگای رستەی سادەوە بەکاردەبا بۆ باسکردنی ئەو شتانەی باسکردنیان ئاسان نیە، بەڵام هاوکات لە پەیوەندی لەگەڵ شتی تردا مانادەدەن. هەست لە پێش بیرەوە دێت و، دەرفەتی وێناکردنی ئەو شتەی دەدا هێشتاکە فۆڕمی بیری وەرنەگرتووە. ئەمە رێک ئەو شتەیە

دڵەڕاوکێ دەگرێتەوە. جا ئەو شتە چیە 'هیچ' ئاماژەی پێدەکا؟ نووسەر لە کتێبەکەیدا بە شێوازی ڕاستەوخۆ پێناسەیەکی لێ پێشکەش دەکا:

"دڵەڕاوکێ سەرگێژەی ئازادییە، کاتێک ئازادی لە دەرفەتەکانی خۆی ڕادەمێنێ."

دوواتر سەبارەت بە ئادەم کە لە لایەن خوداوە خواردنی میوەی بەهەشتی لێ قەدەغە کراو، دەڵێ:

"قەدەغە دەبێتە هۆی دڵەڕاوکێ، چونکە قەدەغە دنەدەری بەئاگاهێنانەوەی دەرفەتی ئازادییە. بێگوناهی وەک 'هیچ'ی دڵەڕاوکێ لە ئادەم دا تێدەپەڕێ، بەڵام کە دێتەوە خۆی دیسان دەگاتەوە هیچ،... ئەوەی کە پێی دەگوترێ توانین و کەچی لە ڕاستیدا دەرفەتێکە پڕە لە دڵەڕاوکێ."

لەم بیگوناهییە خۆبەخۆ و سروشتییەدا ئێمە بیر لەوە ناکەینەوە کە دەرفەتی هەڵبژاردنمان هەیە، هەربۆیە خاوەن وشیارییەکی روون سەبارەت بەو دەرفەتانەی بۆمان دەرەخسێن نین، ئەو دەرفەتانەی وا بنەمای ئازادیین، ئەو ئازادییەی وا بەتووش سەرگێژەوەمان دەکا. دەتوانین بڵێین دڵەڕاوکێ 'هەستی ئازادییە'. لە دڵەڕاوکێ دا وشیاریی سەبارەت بە ئازادی خۆی حەشارداوە کە زیاتر لە هەر بیرێکی تر گرینگە. واتە ئەو تێگەیشتن و زانیارییەی وەک مرۆڤ لەسەر ئازادیی خۆمان هەمانە.

دڵەڕاوکێ خۆی لە کێشمەکێشی نێوان ئەو ترسناکی و سەرنجڕاکێشییەی لە دەرفەتی ئازادیدا هەیە پیشان دەدا. ئەم خاڵە لە لایەن شیرکەگۆردەوە لە کتێبەکەیدا باس دەکرێ. ئەمە وەڵامی ئەو پرسیارەیە لەمەڕ ئەوەی بۆچی هەستی ئازادیی ئەوەندە ئازاراوییە. لە کتێبەکەیدا شیرکەگۆرد دەڵێ کە دڵەڕاوکێ "سیمپاتییەکی تێکەڵ بە نەفرەتە و، نەفرەتێکی تێکەڵ بە سیمپاتی". ئەو دەنووسێ: "دڵەڕاوکێ پەیوەست بوون بەو حاڵەتەیە مرۆڤ لێی دەترسێ، نەفرەتێکی تێکەڵ بە سیمپاتییە. دڵەڕاوکێ هێزێکی بێگانەیە مرۆڤ دەگرێ و ناتوانێ خۆی لێ دەربازبکا. دڵەڕاوکێ ئەو حاڵەتەیە مرۆڤ نایەوێ چونکە لێی دەترسێ، بەڵام هاوکات ئەم ترسە دەبێتە هۆی سەرنجڕاکێش بوونی."

دڵەڕاوکێ لەم کێشمەکێشەدا خۆی دەنوێنێ. ئەوەی کە گەلێک دەرفەت لەبەردەم مرۆڤدا هەیە ترسناکە، ئەو دەرفەتانەی حەزمان لێیان نیە، ئەو دەرفەتانەی کە سەرنجی ئێمە بەرەو خۆیان رادەکێشن، بەڵام هاوکات جورئەتی هەڵبژاردنیانمان نیە. ئەمە بەو واتایە دێت کە لە دڵەڕاوکێدا شتێکی سەرنجڕاکێش هەیە ئێمە بەرەو خۆی رادەکێشێ. بۆیە هاوکات شیرکەگۆرد قسە لەسەر "دڵەڕاوکێی شیرین" و "بوونەوەرێکی شیرین" دەکا. ئەو دەنووسێ: "کاتێک لە منداڵان دەڕوانین دەبینین لەواندا دڵەڕاوکێیەک هەیە کە بە شوێن حەقایەت و ئەو چیرۆکە سەیروسەمەرانەوەیە پڕن لە سەرسوڕمان و عەجاییبات. ئەم دڵەڕاوکێیە ئەوەندە تێکەڵە بە منداڵ کە نایەوێ لە دەستی بدات و ئەو ئازارە دەخاتە قاڵبی ئەو ئاژەڵانەوە خۆشی دەوێن."

گەورەساڵانیش کە جاروبارە لە منداڵ دەچن، دەیانەوێ ئەزموونی سەرسوڕمانی خۆیان لە فیلمی ترسناک، یاخود لە سەفەرێکی نادیار، یان وەرزشێکی پڕ لەخەتەردا ببیننەوە. بەڵام لە پێش هەر شتێکدا ئێمە ئەم هەیەجانە لە نێوان ترس و حەز لە سێکس دا دەبینینەوە، کە ئەمە پێوەندیی نێوان دڵەڕاوکێ و سێکس نیشان دەدا کە کتێبەکەی شیرکەگۆرد دەچێتەوە سەری.

دووا پاژ لەمەڕ دڵەڕاوکێ بریتییە لە "دڵەڕاوکێ وەک رزگاریدەرێک لە بڕوادا"، لێرەدا شیرکەگۆرد لە دڵەراوکێ وەک هێزێکی بنیاتنەر دەڕوانێ. کە مەبەست لە بڕوا، تایبەتمەندییەکە لە رووانین لە ژیاندا کە تێیدا: "زانیارییە دەروونییەکانی ئێمە بەشوێن نەمرییەوەن." خەسڵەتی پۆزەتیڤ و بنیاتنەری دڵەڕاوکێ ئەوەیە کە مرۆڤ لە زیندانی شتە پڕوپووچەکانی ژیان رزگار دەکا. دڵەڕاوکێ "دەچێتە ناو رۆحیەوە و لە شتە بچووک و سنووردارەکان خاوێنی دەکاتەوە." لە رێگای دڵەڕاوکێوە مرۆڤ دەرفەتەکان دەبینێ و دەبێ بە "شاگردی دەرفەتەکان". ئەوجا ئاکام بریتی دەبێ لە دۆخێکی تازە کە مرۆڤ تێیدا لە لایەکەوە زۆر بە ئاسانی دڵەڕاوکێی لە کۆڵ نابێتەوە و لە لایەکی ترەوە دەبێ بە خاوەن ژیانێکی سەرنجڕاکێش، ژیانێک کە تێیدا هەر شتێکی بچووکیش دەبێ بە خاوەن مانا. ئەو دەنووسێ:

"دەرفەت بدە بە کەسێک و لە بیابانێک داینێ، واتە شوێنێک هیچ شتێکی تیا ڕوونادات و تەنیا شتێک کە ڕوودەدات فڕینی ئارامی شاخی ئاژەڵێکە.

ئەمە دەتوانێ ئێمە بیری 'چان' یان 'زێنبودیسم' لە 'ساتوری' دا بخاتەوە کە تێیدا دیاردە ڕۆژانەییەکان کتوپڕ مانایەکی سەیر وەردەگرن. ئەم ئەزموونە لە شیعرێکی چینی دا بەم شێوەیە وەسف دەکرێ:

"ئەمە زۆر شتێکی سەیر و سەمەرە نیە

ئاودێنم و دار دێنم."

لە کۆتاییدا دەبێ بڵێین ئەم پاژە لای شیرکەگۆرد کورتە و سەرنجێکی وەهای نەداوەتێ.

**دڵەڕاوکێ لای مارتین هایدگر**

کتێبی سەرەکیی هایدگر 'بوون و کات'، لە ساڵی ١٩٢٧ نووسراوە. لەم کتێبەدا کە دوواتر لە فەلسەفەی مودێرندا گرینگییەکی گەورە پەیدا دەکا، هایدگر باسی خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی بوونی مرۆڤ دەکاتەوە بە کەڵک وەرگرتن لە فینۆمینۆلۆگیای هوسرەل. هەڵبەت مەبەستی هایدگر ئەوە نیە ئانترۆپۆلۆگی (واتە تیۆر لەسەر مرۆڤ) پێشکەش بکا. مەبەستی ئەو زیاتر ئاراستەکردنی ئێمە بەرەو ڕەوتی سەرلەنوێ دۆزینەوەی جیهانی ژیانە وەها کە تێیدا سەرلەنوێ شتە ڕاستەقینەکان لەبەر چاوماندا بەرجەستەر ببنەوە. چونکە لە ژیانی ڕۆژانەدا مرۆڤ بە هۆی جۆری پەیوەندیی ئەبزاریانە لە گەڵ جیهان و خۆی، شتە بنەڕەتییەکانی لەدەست داوە. ئەو دەیەوێ مرۆڤ بگەڕێنێەوە بۆ ڕاستەقینە، بۆ ئەو ڕاستەقینەیەی ڕاستەقینەیە، بۆ ئەوەی هەیە، بۆ 'بوون'. ئەمە لە فەلسەفەی پێش هایدگردا کەمتر گرینگی پێدەدرا و بەڵام هەنووکە گرینگی پێدەدرا. هادیگر 'دڵەڕاوکێ'ی چاک دەناسی. ئەو دەستەواژەیەی لە فەلسەفەی ئەودا وەک دەستپێک دەوردەگێڕێ.

هایدگر مانایەکی تایبەت دەدا بە دڵەڕاوکێ، مانایەک وەک دەربڕی حاڵەت، یان رەنگە دەتوانین بڵێین حاڵەتێکی بنەڕەتی یاخود حاڵەتی ژیان کە پەیوەند لەگەڵ راستی دەنوێنێتەوە. لە لایەکەوە هایدگر دەڵێ دڵەڕاوکێ حاڵەتێکە کە لە مرۆڤەکاندا خۆی خۆی دەنوێنێتەوە، لە لایەکی ترەوە دەڵێ دڵەڕاوکێ دەمانترسێنێ چونکە خودی 'بوون'ە. بۆ هایدگر هەر دووکی ئەم حاڵەتانە یەک مەوزوعن. کاتێک ئێمە بەرامبەر بوون دەبینەوە، خۆمان ئاشکرا دەکەین، ئەمە سەرەڕای ئەو دەرفەتانەن بۆمان دەڕەخسن. بەڵام لە هەمان کاتدا مرۆڤ هەوڵدەدا خۆی لەم دڵەڕاوکێ بنەڕەتییە، لە جیهان وەک بوون و وەک دەرفەت دوور رابگرێ، ئەو دەرفەتانەی وا فرێمان دەدەنە ناو بوونێکی غەیرە شەخسییەوە، بۆ وێنە دەرفەتگەلی وەک 'مرۆڤ دەبێ ئاوا و ئاوا بژی'، یان 'مرۆڤ دەبێ بەم شێوازە هەلس و کەوت بکا' و، شتی تری لەم بابەتە. بۆیە مرۆڤ، لە دەست دەرفەتەکانی بوون بە مرۆڤێکی راستەقینە، واتە مرۆڤێک کە خۆیەتی، هەڵدێ. بەڵام ئێمە ناتوانین لە خۆمان قوتاربین، بۆیە هەڵاتن یاخود خۆ دوور راگرتنەکەیشمان شێوازێکە بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ خۆمان. جێگرەوە بریتی دەبێ لە دڵەڕاوکێ، ئەو دڵەڕاوکێیەی وەک دەرفەتێک خۆمان لە بەرامبەر خۆمان دا ئاشکرا دەکا، وەک شیرکەگۆرد دەڵێ دڵەڕاوکێ وەک سەرەگێژەی مرۆڤە کاتێک بەرامبەر دەرفەت دەبێتەوە. بە گشتی هایدگر لە دڵەڕاوکێ وەک دیاردەیەکی پوزەتیڤ دەڕوانێ، ئەگەرچی دڵەڕاوکێ ئاماژەیەکە بەو ترسەی مرۆڤ هەیەتی بەرامبەر بەو بوونەی لەبەرامبەریدا راوەستاوە، ئەو بوونەی هەوڵدەدەین لێی دوورە بکەوینەوە و خۆمانی لێدەرباز بکەین.

ئەوەی دەبێتە هۆی دڵەڕاوکێ، نەک بوونێکی کۆنکرێت و دیار، یان شتی سادە، بەڵکو 'بوون'ە. هەربۆیە دڵەڕاوکێ خۆی لە بێ سنووری دەدا. هەروەها چونکە ئەم دیاردە ترسناکە لە شوێنێکی تایبەت دا نیە، وەها لێمان نزیک دەکەوێتەوە کە هەناسەمان پێ سواردەکا.

گۆڕانێکی سەرنجڕاکێش کاتێکە هایدگر سەبارەت بە ترس دەدوێ و بۆچوونی شیرکەگۆرد سەبارەت بە جیاوازیی ترس و دڵەڕاوکێ دەکا بە خاڵی دەستپێکی قسەکەی. لای ئەم بیرمەندە ترس لە دڵەڕاوکێوە سەرچاوە دەگرێ، واتە ئەوە دڵەڕاوکێیە کە ترس پێکدێنێ و لەراستیدا ترس جۆرێک دڵەڕاوکێی نابەجێیە.

لە لێکدانەوەی دڵەڕاوکێ لە کتێبی 'بوون و کات'دا چەند جارێک بە شێوەی کاتی و ڕاگوزاری گوێمان لە وشەی 'هیچ' دەبێ. بە شێوەی ڕاگوزاری، چونکە 'بوون' شتێک نیە وەک 'هیچ' خۆی بنوێنێ. لە درێژەی باسەکەیدا تەئکید لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بوون بریتی نیە لە هیچیەتییەکی تەواو، چونکە لە پێناوی شتێکدایە، شتێک وەک جیهان بە گشتی، شتێک وەک بوون.

دەستەواژەی 'هیچ' و پەیوەندییەکەی لە گەڵ دڵەڕاوکێ دا لە وانەگوتنەوەیەک لە ژێر ناوی 'میتافیزیک چییە؟" لە لایەن هایدگرەوە وەک پرۆفیسۆر لە هایدبەرگ بە تێروتەسەلی باسی لێدەکرێ، واتە دوو ساڵ دووای ئەوەی کتێبی 'بوون و کات' درایە دەرەوە. هایدگر لە قسەکانیدا نایەوێ بە گشتی وەڵامی پرسیاری 'میتافیزیک چییە؟' بداتەوە، بەڵام هەولدەدا وەڵامی بداتەوە بە باسکردن لە سەر پرسیارێکی سادەی میتافیزیکی، واتە پرسیار لەسەر هیچ و مانای هیچ.

'هیچ' شتێکە خۆی نیشان دەدا، یان شتێکە ئێمە لە بەردەمیدا ڕاوەستاوین، بە تەئکید بە هۆی ئەوەوە ئیمە ڕووبەڕووی 'بوون' دەبینەوە. بە هۆی ئەوەوە کە 'بوون' دەبێ بە جێگای لێکدانەوە چونکە 'بوون' بە تووش 'نەبوون'ەوە دەبێ، واتە بە تووش 'هیچ'ەوە. لێرەدا قسە لەسەر زانیاری ئێمە لەسەر وشە و دەستەواژەکان نیە، بە پێچەوانەوە قسە لەسەر ئەزموونە، شێوازێک کە جیهان خۆی پیشانی ئێمە دەدا. هایدگر لێرەدا نموونەیەکمان بۆ باس دەکا. ئەو باسی ئەو لەززەتەی دەکا سەبارەت بە مەعشوق کە لە ئاشق دا پێک دێت. هۆکاری ئەم لەززەتە تەنیا لەوەدا نیە ئەو کەسەی خۆشمان دەوێ، هەیە، بەڵکو لەو شێوازەدایە کە بوونی ئەو خۆی نیشان دەدا. واتە بە بێ ئەم لەززەتە، بوونی مەعشوق خۆی نانوێنێ.

هاوشێوەی ئەمە حاڵەتی دڵەڕاوکێیە کە ئێمە بەرامبەر 'هیچ' دەکاتەوە. هیچێک کە لە 'بوون'ێکەوە سەرچاوە دەگرێ خۆیمان لێ دووردەخاتەوە. ئەمە بەرەوڕووی ئەزموونێکمان دەکاتەوە کە تێیدا بوون وەک گشتییەتێک و نە وەک شت (شتە سادە و بێ نرخەکان) خۆی دەردەخا. وەک بڵێی بوون هەمیشە خۆی لە شێوازێکی سەیروسەمەرەدا نیشان دەدا، واتە

هاوکات وەک شتێک کە هەیە و هەر لەو کاتەدا وەک شتێک کە لێمان دووردەکەوێتەوە کاتێک ئێمە بەرامبەر 'هیچ' رادەوەستین.

ئەو دەنووسێ: "تەنیا بە هۆی کراوەیی 'هیچ'ەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێ لە هەبوونی خۆیدا دا بەرەو وجود بڕوات و بچێتە ناویەوە،... بە بێ کراوەیی 'هیچ'، نە 'بوون لە خۆیدا' هەیە و نە ئازادی." لاپەڕەی ١١٢

یان بە شێوازێکی زیاتر شاعیرانە:

"لە رۆشنایی شەوی دڵەڕاوکێی هیچ دا، سەرەتا کراوەیی بوون خۆی دەنوێنێ، وەک: بوونێک کە هەیە و نەک هیچ."

بۆ ئەوەی لە بێری هایدگر لەمەڕ هیچ و دڵەڕاوکێ وەک حاڵت بگەین، دەبێ خوێنەر واز لە هەندێ عادەتی زمانی بێنێ و خۆی بخاتە ناو چوارچێوەی تایبەتی زمانی هایدگرەوە. گەلێک کەس لەم بارەیەوە رەخنەیان لە هایدگر گرتووە. زمانی ئەم بیرمەندە خۆی لەقەرەی زمانی شیعری دەدا کە تێیدا مرۆڤ هەست دەکا دەتوانێ لە هەندێ شت بگا، بەڵام هاوکات بە بێ گفتوگۆیەکی رەخنەیی ناتوانێ درێژەی بدا. خوێنەر کاتێک بەرهەمی ئەو دەخوێنێتەوە، بیردەکاتەوە داخۆ خەریکی خوێندنەوەی دەقی فەلسەفییە یا دەقێک کە خۆی لە مانا دەروونناسییەکان دەدا؟ لێرەدا نموونەیەک دەتوانێ وشەی Nichts, بێت کە زۆرینە وەک سوبستانسێک لێکی دەدەنەوە لە پانتایی ژیانی زمانێکی تازەدا، وشەیەک کە تەنیا بە مانای 'هیچ' دێ و بەس. هایدگر دەڵێ کە 'هیچ' لە پێش رەدکردنەوە (یان ئینکار)دا دێ و 'هیچ' ئەو دیاردەیەیە کە دەرفەتی رەدکردنەوە (واتە ئینکار) دەڕەخسێنێ. ئەمە، گوتەی لەم چەشنەی بە شوێن دا دێ کە "هیچ لە پێش ئینکار دا دێ." بە گوێرەی هایدگر، لەو کاتەدا ئێمە لەسەر 'هیچ' زانیاری پەیدا دەکەین کاتێک کەڵک لە ئینکار وەردەگرین.

## دڵەڕاوکێ لای ژان پۆل سارتێر

بۆ یەکەم جار سارتێر لە وتارێکدا کاتێک باسی دڵەڕاوکێی کرد کە لە بەرلین لە ساڵەکانی ١٩٣٣ ـ ٣٤ دا دەژیا. ئەو کاتە لەوێ خەریکی خوێندنی هوسرەل و هایدگر بوو. وتارەکەیشی لە ژێر ناونیشانی 'لایەنی بان ئەزموونیی کەسایەتی' دوو ساڵ دوواتر لە ساڵی ١٩٣٦ دا بڵاوکردەوە. وتارەکەی سارتێر باس لە پەیوەندی نێوان وشیاری (خود) و ئێگۆ (من) دەکا. ئەو بە جیاوازیی نێوان وشیارییەک کە توانای خۆدەربڕینی هەیە و وشیارییەک کە توانای خۆدەربڕینی نیە (وشیاریی سڕ ـ و.)، دەست پێدەکا. کە تێیدا وشیاریی سڕ ئەسڵ و سەرەتایە. لەم حاڵەتەدا وشیاری ناتوانێ دەرکێکی لەمەڕ خۆی هەبێ، وشیاری ناتوانێ خۆی بکا بە ئۆبیەکت، بۆیە لە بەشی خۆدەربڕیندا ئێگۆ واتە من چێدەکا بۆ ئەوەی بتوانێ پەیوەندی لەگەڵ خۆی بەرقەرار بکا. بۆیە ئێگۆ ئۆبیەکتێکە بۆ وشیاری و لە پشت وشیارییەوە نیە. ئێگۆ ئەو بەشەیە کە سترۆکتۆری کەسایەتیی ئێمەی هەڵگرتووە، ئێگۆ ناوکی هەموو مودێلە کردارییەکانی ئێمەی پێکهێناوە. بۆیە ئێگۆ وەک شاراوە خۆی دەنوێنێ، ئێگۆ ئەو خۆبەخۆییە دەشارێتەوە وا وشیاری خاوەنیتەی. ئەم خۆبەخۆییە خاوەن هیچ فۆڕم یان سنوورێک نیە، بۆیە سەرچاوەی دڵەڕاوکێیە. لێرەدا سارتێر نموونەیەک دێنێتەوە کە تێیدا ژنێک کە تازە شووی کردووە و لە ماڵەوە کاتێک بە تەنیایە، لەوە دەترسێ کە دەبێ وەک ژنێکی سۆزانی پێشنیاری فرۆشتنی لەشی خۆی بەو رێبوارانە بدا کە لەویوە دەگوزەرین. ئە م ژنە هەروەها دڵەڕاوکێی هەیە سەبارەت بەوەی کە دەبێ چ بکا لە ئاست ئەو دڵەڕاوکێیەی دەروازەی دەرفەتەکانی بۆ دەکاتەوە. سارتەر هەر بەو شێوەیەی شیرکەگۆرد دەڵێ مرۆڤ دەتوانێ ئەمە ناو بنێ "سەرگێژەیەک، دەرفەت دەیخوڵقێنێ."

ئێگۆ (من)، لەم وتارەی سارتێردا وەک دیاردەیەکی زەروور و هەر لەو کاتەدا وەک ئایدیایەکی درۆ دەردەکەوێ. جا بۆیە رەنگە ئەمە کاتێک روودەدات وشیاری بەم بەرهەمە واتە بە ئێگۆدا بچێتەوە وا بۆخۆی درووستی کردووە و، لەوە تێدەگا کە ناتوانێ خۆی لە ئەم رەوتە خۆبەخۆیە دەرباز بکا. بۆیە:

"... کتوپڕ وشیاری بە تووش ئەو دڵەڕاوکێیەوە دەبێ کە داخۆ چ ناوێک بخاتە سەر ئەو رەوتە خۆبەخۆییە وا ناتوانێ خۆی لێ دەرباز بکا: جا ئەم دڵەڕاوکێ ناخۆش و موتڵەقە، ئەم ترسە، کە خۆی وەک وشیارییەکی رووت و درووستکەر نیشان دەدا کلیلی ئەو دڵەڕاوکێیە وا باسمان لێ کرد. ئەگەر 'من' لە "من بیردەکەمەوە" ببێ بە سترۆکتۆری سەرەکیی وشیاری، ئەوا دڵەڕاوکێ غەیرەمومکین دەبێ."

لێرەدا ئێمە بە جۆرێک گوێمان لە شیرکەگۆرد و هایدگر دەبێتەوە، کاتێک شیرکەگۆرد باس لە لەو سەرگێژەیە دەکا کاتێک مرۆڤ بە تووش دەرفەتەکانەوە دەبێ و کاتێک هایدگریش باس لەوە دەکا کە مرۆڤ کاتێک لە بەرامبەر خۆیدا رادەوەستێ بەتووش دڵەڕاوکێوە دەبێ. لێرەدا ئێمە لەبەرامبەر خۆماندا رادەوەستین وەک 'وشیارییەکی رووت' کاتێک بە ئێگۆ واتە من دا دەچینەوە.

لە ١٩٣٤ ـ ٤٠، لە کاتی بەرەنگاربوونەوەی پۆلۆنییەکان لە دژی داگیرکاریی ئاڵمانی و پێش هێرشی ئاڵمان بۆ فەرەنسە، سارتەری هێشتا ئاسایی ژیانێکی ئارام وەک چاودێری کەشناسی لە پشت هێڵی جەبهەوە بەسەردەبا. لەم سەردەمەدا ئەو خەریکی نووسینی یاداشتەکانیەتی کە سەرەتایەک بوون بۆ کتێبەکانی. ئەو هەروەها خەریکی خوێندنەوە لەسەر دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوەکانی لەمەڕ ئەم چەمکەیە کە رەگیشی لەو خوێندنەوانەدا هەیە لەوە پێش لەسەر هایدگر هەیبوو.

"ئەگەر شیرکەگۆرد لەوەدا راستە کە دڵەڕاوکێ وەک 'دەرفەتی ئازادی' پێناسە دەکا، کەواتە ئەمە ئاماژەیەکە بە دڵەڕاوکێ کە من دووبارە ئەم بەیانییە زانیم بەتەواوی ئازادبووم لەوەی ئەو لەتە نانەی ژنە خزمەتکارەکە لە تەنیشت من لەسەر مێزەکە دایناوو بیبڕم و، ئەوسا ئازادانە بیخەمە دەممەوە. کەس لەم دونیایە ناتوانێ بەر بەمە بگرێ، تەنانەت خۆیشم. چونکە وازهێنان (لەکارێک) بە مانای بەرپێگرتنی خۆنیە٢٠... وازهێنان تەنیا بە مانای وەدوواخستنە، مانەوە لە نادڵنیاییدایە، بە مانای سەرقاڵبوون بە دەرفەتەکانی دیکەوەیە.

بەرپێگرتن وەک ئەوە وایە دەستێکی بەهێزبێت و قۆلت مەحکەم بگرێت. بەڵام من خاوەنی وەها دەستێک نیم؛ من ناتوانم لەمپەر لە نێوان خۆم و دەرفەتەکانی خۆم دروستبکەم. ...

لە شیرکەگۆردیش نموونە دێنێتەوە:

... پێوەندی دڵەڕاوکێ بە بابەتەکەیەوە، بە شتەکەوە، جا هەرچی بێ بریتییە لەوەی شتەکە نەبێ (بە واتایەکی تر، وەک لای ژنی سکپڕ: دڵەڕاوکێ بۆ ئەوەی منداڵەکەی بە مردوویی لەدایک بێت، واتە دڵەڕاوکێ بۆ نەبوون)

وە ئاماژە بەوەدەکا ئێمە لێرەدا کارێگەریی راستەوخۆ لەسەر هایدگێر دەبینین کە تێیداچەمکە سایکۆلۆژییەکانی شیرکەگۆرد بە شێوەی میتافیزیک لێکدەداتەوە. سارتێر لێرەدا ئەوەی دەنووسێ کە دەبێ بە کلیلی فەلسەفەی خۆی لەسەر دڵەڕاوکێ:

"دڵەڕاوکێ بۆ نەبوونیەتی، لای هایدگێر؟ دڵەڕاوکێ بۆ ئازاد، لای شیرکەگۆرد؟ لەلای من هەر دووکی ئەمانە یەک شتن، چونکە ئازادی شێوازی دەرکەوتنی نەبوونیەتییە لە جیهاندا. ...واقعییەتی مرۆڤ لەناوبردنی واقعییەتە، بە یارمەتی ئازادییە ئێمە دەتوانین وێنای شتەکان لای خۆمان بکەین، واتە لە هەمان کاتەدا لەناوبردن و بە تێماکردنی شتەکان لە جیهان. لە رێگای ئازادییەوەیە ئێمە هەموو کاتێک دەتوانین لەگەڵ زاتی خۆمان مەودا دروستبکەین کە لە ناو نەبوونیەتیدا لەناودەچێ و ئاسەواری نامێنێ. ئازادی، دابڕان دروستدەکا؛ پێوەندی دەپچڕێنێ. ...دڵەڕاوکێ بۆ نەبوونیەتی هەمان دڵەڕاوکێیە بۆ ئازادی... نەبوونیەتی کونێک نیە پێمان درابێ... لە راستیدا نەبوونیەتی هەمان نەبوونیەتییە خۆمان هەین."

بۆیە بنەمای خوێندنەوە سیستماتیک و وردەکانی سارتێر سەبارەت بە پێوەندیی نێوان دڵەڕاوکێ و ئازادی لە کتێبی 'بوون و نەبوون' لەساڵی ١٩٤٣، کە یەکێک لە دوو کارە گرینگەکانی ئەوە، چێدەبێ. لێرەدا ئەو بەشێوەی بەرین کار لەسەر دڵەڕاوکێ دەکا. سارتێر لە ئایدیاکانی هایدگێر لەسەر چەمکی نەبوونیەتی بۆ چوونە ناو باسەکە کەڵک وەردەگرێ کە هاوکات رەخنەیشی لێدەگرێ، بەڵام لای سارتێر پێش لەهەر شتێک فوکوس لەسەر پێوەندیی

نێوان دڵەڕاوکێ و ئازادییە. چەمکی نەبوونیەتی بەردەوام ڕۆڵێکی سەرەکی لای ئەو دەگێڕێ، بەڵام هەنووکە وەک بەشێک لە ئازادیی وجوودی.

سارتێر سێ نموونەمان پێشکەشدەکا. نموونەی یەکەم ڕێبوارێکە دەگاتە هەڵدێرێک لە کوێستان و بە هۆی بەرزاییەکەیەوە بەتووش سەرگێژەو دڵەڕاوکێوە دەبێ. سارتێر تەئکید لەسەر ئەوەدەکا نابێ ئەمە لەگەڵ ترس لێمان تێکبچێ کە دەکرێ ئەویش هەبێ، ترس لەوەیکە قاچمان لەسەر بەردێک هەڵخزێ، یاخود کەسێکی تر پاڵمان پێوەنێ و بمانخاتە خوارەوە. سەرەگێژە، دڵەڕاوکێ، بریتیە لەوەی کەسەکە ئازادیی ئەوەی هەیە خۆی فڕێبداتە خوارەوە، ئەمە دەرفەتێکە، هەروەها نەبوون، لێرەدا نەبوون خۆی دەهاوێتە ژوورەوە، ئەو نەبوونەی کە بەر بەوە دەگرێ کەسەکە خۆی هەڵداوێ. لێرەدا ئێمە ئەوەی دەناسینەوە کە لای هایدگێر مێتافۆرە، سەرەگێژە کە بەهۆی سەیرکردنی خوارەوە لە هەڵدێرەکەوە بەتووشمانەوە دەبێ، وەک دەرفەتێک.

نموونەی دووهەم، بەشی سەربازی پیادەیە لە جەنگدا کە دەتوانن ترسی ئەوەیان هەبێ بە هۆی فیشەک یاخود نارنجۆکێکەوە بپێکرێن. ئەمە ترسە. ئەوجا بۆ سەربازەکە دەگەڕێتەوە چلۆن بەرەورووی ئەم ترسە بێتەوە، داخۆ ترسنۆک دەبێ یان ئازا؟ سارتێر دیسان ئەم ترسە وەک دڵەڕاوکێ پێناسە دەکا، دڵەڕاوکێی ئەوەی داخۆ سەربازەکە بڕیاری چی دەدا.

نموونەی سێهەم کاسبکارێکی دەوڵەمەندی وەرشکستە. ئەم کاسبکارە دەتوانێ بە دوو شێوازی جیا بەرەوڕووی ئەم دۆخەی خۆی بێتەوە: بە شێوازی ترس و بەشێوازی دڵەڕاوکێ. ترس لە هەژاری، ئەوەیکە نەتوانێ نانەسکیس پەیدابکا. بەڵام ئەم دۆخە دەتوانێ جۆرێکی تر لە کردەی لێبکەوێتەوە، واتە دڵەڕاوکێ، ئەوەیکە کاسبکارەکە چی بکا و، گەر کردیشی داخۆ کردەیەکی دروستبووە یان نا؟ سارتێر باسی ئەوە دەکا تەنانەت کاسبکارێکی سەرکەوتوویش دەتوانێ هەست بە دڵەڕاوکێ بکا. ئەوەیکە داخۆ دەتوانێ شوێنی خۆی بەردەوام بپارێزێ یان نا؟ دڵەڕاوکێ دەیشتوانێ بریتی بێت باوەڕنەکردن بە خۆ.

سارتێر هەوڵدەدا ئەمە بە بوونی مرۆڤ بسڕێتەوە کە ئێمە ناومان ناوە ئازادی و لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دڵەڕاوکێدا بەتووشییەوە دەبین. جا لێرەدا بەچەندا جار کەڵک لە وشەگەلی نەبوون و نەبوونییەت وەردەگرێ. مەبەستی سەرەکی ئەوەیە ئێمە خۆمان لەهەموو ئەو وێنایانە بەتاڵبکەینەوە لەسەر ئەوەی کە ئێمە لەلایەن شتە دەرەکییەکانەوە بڕیارمان لەسەر دەدرێ. نەتەنیا هۆکارە سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتییە دەرەکییەکان دەبێ لاببەین، بەڵکو هەروەها دەرفەتەکانی خۆم، ئەو شتانەی دنەم دەدەن، بڕیارەکانی زوو و هتد. لەهەموو شوێنێک من پارێزگاریم لێدەکرێ بە هۆی نەبوونییەتەوە لەبەرامبەر هەموو ئەو شتانەی ئازادیی سنووردار دەکەن.

یەکەم: داخۆ من بە هۆی کۆمەڵێک دەرفەتەوە سنووردار دەکرێم؟ کاتێک دەرفەتێک دەبینم، لەم دەرفەتەدا کردەیەکی خوڵقێنەر خۆی حەشارداوە. جیهان لەخۆیدا تەنیا لە فاکت پێک هاتووە و لە بواری کردەدا خاوەن ئەڵتەرناتیڤە جۆربەجۆرەکان نیە بۆ مرۆڤ. گۆڕینی فاکت بۆ دەرفەت پێویستیی بە خەیاڵی من هەیە. دەرفەتەکان ئاکامی یاریی نێوان من و خەیاڵە ئازادەکانی منن لە لایەکەوە و، لە لایەکی تریشەوە لە نێوان من و دونیای دەرەوە. بۆیە دەرفەتەکان لە لایەن منەوە چێکراون نەک جیهان. ئازادی زیاترە لە دەرفەتی هەڵبژاردن لەنێوان ئەڵتەرناتیڤەکاندا، ئازادی بریتیشە لەوەی من دەبێ بۆ خۆم 'بڕوانم' یاخود بە یارمەتی خەیاڵ ئەو دەرفەتانە چێبکەم کە دوواتر دەمەوێ لەناویاندا هەڵبژێرم. خەیاڵیش بریتییە لە وێناکردنی شتێک کە نیە، هەروەها وێناکردنی 'نەبوون'یش. تێگەیشتن لەمە لەگەڵ خۆی دڵەڕواکێ دێنێ.

دووهەم: داخۆ من بەهۆی دنەدەرەکانی خۆمەوە، کە کردەکانم کۆنتڕۆل دەکەن، سنووردارکراوم؟ نا، من دەتوانم خاوەن دنەدەربم، کە هاوکات خوڵقێنراوەکانی خۆیشمن، بەڵام دنەدەرەکان خاوەن کاریگەری نین، کەس ناتوانێ من ناچاربکا شوێنیان بکەوم. بۆیە هەموو هەڵبژاردنەکان بێ بنەمان، ئەوان دەتوانن بەگوێرەی دنەدەرەکان بن، بەڵام من دەبێ بۆخۆم ئەوە هەڵبژێرم کە بە گوێرەی دنەدەرەکان بم. مەبەست لە بێ بنەما ئەوەیە کە

بنەماکانیان لە ئێمەدان، بە بێ هیچ چەشنە یاریدەدەرێکی دەرەکی. ئەمەیش هەروەها هەڵگری دڵەڕاوکێیە.

سێهەم: سەبارەت بە داهاتوو من دەتوانم بۆ خۆم پلان دابڕێژم، پلان هەڵبژێرم. بەڵام لە نێوان 'من' منێک کە هەنووکە هەم و 'من'ێک کە دوواتر دێت، جیاوازییەک هەیە، دیسان نەبوون. ئێمە دەگۆڕدرێین و من ناتوانم بزانم سبەی چۆن دەبم. داخۆ من کردەی ئەمڕۆی خۆم، کە بە دروستی دەزانم، تاوانباردەکەم؟ دڵەڕاوکێ هەروەها بریتییە لە وشیاری لەسەر ئەوەیکە من بنەمای ئەو شتەم کە ئێستاکە نیە و سبەی دەبم؛ کە ئەمەیش دیسان هەمان 'نەبوون'ە.

چوارەم: سەبارەت بە رابردوو: زۆربەی ئەو کردانەی ئەمڕۆکە دەیانکەین لەسەر بڕیارەکانی پێشوو راوەستاون، کە بەڕواڵەت ئازادیی هەڵبژاردنی منیان سنووردارکردووە. بەڵام رابردوو وەک دنەدەرەکانی من بە بێ کاریگەریی نیە. نموونەی ناسراوی سارتێر بۆ ئەمە قومارباز‌ێکە کە لە تەنیشت مێزی قومارەکە راوەستاوە بە وشیارییەکی تەواو لەسەر ئەو بڕیارەی دوێنێی خۆی کە ئیتر قەت قومار نەکا. بەڵام ئیستا تێدەگا بڕیارەکەی دوێنێی خۆی کەڵکی نیە. ئەم قوماربازە بۆ ئەوەی قومارنەکا، دەبێ سەرلەنوێ بڕیارەکەی بداتەوە. کە ئەمەیش دەبێ لە هیچەوە واتە لە 'نەبوون'ەوە دروست بکرێتەوە، چونکە ئێمە لە بڕیارەکانی رابردوو جیاین بە هۆی 'نەبوون'ەوە.

سارتێر لە رێگای بەکارهێنانی وشەی 'نەبوون' وێنەیەک لە سوبیەکتی لاکەوتە، دابڕاو و دەورەدراو بە چۆڵەوانی چێدەکا = نەبوونێک کە لاوازە و خۆ دەخزێنێتە نێوان من و دەرفەتەکانم، نێوان من و دنەدەرەکانم، نێوان من و رابردووی من یاخود داهاتووی من و، دابڕانێک لە هەموو بوارەکاندا دروستدەکا.

"ئەگەر کەسێک بپرسێ نەبوون چییە کە بنەمایەک بۆ ئازادی چێدەکا، دەبێ جواب بدەینەوە لەبەر ئەوەی نیە ناتوانین وەسفی بکەین، بەڵام دەتوانین لانیکەم بە وتنی ئەوەی نەبوون لەگەڵ خۆیدا بوون دێنێ، تیشکێک بخەینە سەری. ... ئازادی کە لە رێگای دڵەڕاوکێوە خۆی

نیشانەدا، لە ڕێگای تازەکردنەوەی بەردەوامی ئەو ئەرکانەوە پێناسەدەکرێ کە 'من' سەرلەنوێ دروستدەکاتەوە کە ئەمەیش نیشانەدەری 'بوون'ی ئازادە."

ئێمە تەنیا بە هۆی نەبوونایەتی (نەبوونییەت) تەنیا لە رابردوو، داهاتوو، دەرفەتەکان و دنەدەرەکان کە سەرەڕای هەمووشتێ لەخۆمان جیاوازن، دانەبڕاوین، بەڵکو لە ئاستێکیشدا لە خۆیشمان دابڕاوین. ئەمە خۆی لە جیابوونەوەی نێوان 'ئێگو' لە لایەک و وشیاری یاخود 'خود' لەلایەکی ترەوە نیشاندەدا. ئێگو باس لە زات، سرووشت و کەسایەتیمان دەکا کە ئێمە بەکاری دێنین بۆ روونکردنەوەی کردەکانمان:

"زات لە مرۆڤدا هەموو شتێکە کە ئێمە دەتوانین بەم وشانە باسی لێبکەین: "ئەمە..." ئەو وشانەی وا کۆمەڵێک تایبەتمەندین و کردە شیدەکەنەوە. بەڵام کردە هەمیشە واوەترە لە زات؛ کردەیەکی مرۆڤانەیە لەو ئاراستەیەدا کە واوەتر دەڕوا لە هەر شیکردنەوەیەک ئێمە دەتوانین پێی ببەخشین. ...سەرڕێژکردنی وشیاریی ئێمە بەرەبەرە سرووشتی ئێمە چێدەکا، بەڵام ئەمە بەردەوام لەپشت سەرمان جێدەمێنێ ووەک ئۆبیەکتێکی نەگۆڕ کە دەرفەتی تێگەیشتنمان دەداتێ لای لێدەکەینەوە."

دڵەڕاوکێ تێگەیشتنە لە خود هەتا ئەو جێگایەی ئەم خودە لەوەی کە هەیە دابڕاوە، خودێک دەورەدراو و لادراو بە 'نەبوون'. لە دڵەڕاوکێدا ئێمە لە خۆمان وەک کەسی بێ بنەما دەگەین، کە ئەمەیش هەمان ئازادییە.

سارتێر هەروەها باس لە شتێک دەکا کە وەک کێشە لێی تێدەگا و، هایدگێریش هەر بەهەمان شێوە رووبەڕووی دەبێتەوە: بۆچی دڵەڕاوکێ ئەوەندە دەگمەنە؟ وەک هایدگێر ئەویش بەهەمان شێوە وەڵام دەداتەوە و، دەڵێ لە ئازادی خۆمان دەبوێرین چونکە دەبێتە هۆی دڵەڕاوکێ. لەبەر ئەوەی ئازادی دەمانترسێنێ، نەبوونایەتی دەمانترسێنێ، ئەمانە دەبنە هۆی سەرەگێژە و ناخۆشیمان، دەبنە هۆی ترسی لەرادەبەدەر و شەرم، بۆیە لەدەستی رادەکەین. وەسفی سارتێر لەم راکردنە زۆر لە وەسفەکەی هایدگێر جیاواز نیە، بەڵام رەنگە زیاتر کۆنکرێت و سیستماتیک بێت. سارتێر دەستەواژەی "باوەڕی خراپ" (mauvaise foi)

چێدەکا وەک چەمکێک لە بەرانبەر باوەڕی چاکدا. سەبارەت بە باوەڕی خراپ دەڵێ کاتێک ئێمە لە باوەڕی خراپداین، خەریکی وێناکردنی خۆمانین بە شێوازێکی تر جیا لەوەی لە واقعدا هەین، بەڵام پێش لەهەر شتێک ئێمە ئەمە لەسەر خۆمان ئەنجامدەدەین. لێرەدا ئێمە دەچینە ناو رۆڵێکەوە (کایەیەک) کە تێیدا وادەنوێنین ئێمە لەوەی هەین شتێکی جیاوازین. وە لە راستیدا هاوکات دەزانین ئەمە وێنایەکی ناڕاستە لە خۆمان. لەم کایەیەدا هەوڵدەدەین لە خۆمان وەک کەسێک تێبگەین کە لە لایەن بڕیارەکانی پێشووتر، دنەدەرەکان و دۆخە دەرەکییەکانەوە کۆنترۆڵ دەکرێین کە بڕیاردەرن لەسەر ئەو کەسەی ئێمە هەین. بەڵام ئێمە دەبێ بەو شێوەیەی هەڵسوکەوتبکەین کە دەیکەین چونکە ئەوەین کە هەین و دونیایش ئەوەیە کە هەیە. ئێمە هۆکاری کردەکانمان شیدەکەینەوە و شوێنی خۆمان دیاریدەکەین، نەک بەجیا و تەریک لە 'نەبوون'؛ بەڵام مەحکەم و بەردوام جێگیر لە زنجیرەی کارتێکەرییەکاندا.

بۆیە ئێمە دەتوانین دووری بکەین لە هەبوونمان لەناو دڵەڕاوکێدا، ئەو دڵەڕاوکێیەی کە بەهەرحاڵ لەوێیە و ئێمە لە دەروونی خۆماندا وێنەی درۆیینی خۆمانی تیادەبینین، دڵەڕاوکێیەک لە بەرگی غەیری خۆیدا. لێرەدا وەک شتێکی ناخۆش لە دۆخە جۆراوجۆرەکانداخۆی پیشان دەدا، وەک خۆگۆشین و ترس لەو شتانەی کە لە راستیدا جێگای ترس نین، بۆ وێنە وەک ترس لە سەرئێشە و نائارامی، ترس لە بێحورمەتی و تیامانەوە و بڕیارنەدان.

پێوەندێکی نزیک، سەرەڕای جیاوازییەکانیان، لەنێوان تیۆرەکانی شیرکەگۆرد، هایدگێر و سارتێردا سەبارەت بە دڵەڕاوکێ هەیە. دەزانین کە هایدگێر ٢٤لە ژێر کاریگەریی شیرکەگۆرددایە و، سارتێریش لە ژێر کاریگەریی شیرکەگۆرد و هایدگێردا. هایدگێر هەندێ روانگە دێنێتە گۆڕێ کە سەرەڕای پێوەندییەکانیان، زۆر جیاواز لەوانەی شیرکەگۆردن. سارتێر هەم تیۆرەکانی هایدگێر گەشەپێدەدا و هەم رەخنەیان لێدەگرێ. بۆیە دەتوانین لەم سێ کەسە وەک سێ بیرمەندی نوێنەری یەک تیۆری بڕوانین، بەڵام تیۆرێک کە لە گەشەدایە و لە بەرگی جۆراوجۆردا خۆی نیشاندەدا، واتە تیۆری دڵەڕاوکێی وجوودی. تیۆری شیرکەگۆرد

لەم بوارەدا لەوانی تر ئاڵۆزترە. ئەو، بەرگی تیۆلۆژی و فەلسەفەی لەبەر ئەم تیۆرە دەکا، هاوکات لەگەڵ ئەوەیکە لە زۆر شوێندا خاوەن ڕووانینێکی سایکۆلۆژیانەی تایبەتیشە. کتێبی 'چەمکی دڵەڕاوکێ' خۆی لەخۆیدا ئاڵۆز و دژوارە. لەناو ئەم سیانەدا، لەباری ئایدیاوە، شیرکەگۆرد لەوانی تر دەوڵەمەندترە، بەڵام هاوکات کەمتر خاوەنی سیستمە. تیۆرەکانی هایدگێر و سارتێریش ، لەچاو شیرکەگۆرد، لەسادەبوونیاندا بەرچاون. بۆ ئەو کەسەی حەزدەکا لە تیۆری دڵەراوکی بگا و خۆی بهاوێتە ناو دەقەکانی هایدگێر و سارتێرەوە، پێش لەهەر شتێک دژوارییەکە لە ناسینی ئەو بنەما فەلسەفییەی خۆی دەردەخا کە ئەوان فەلسەفەکەی خۆیانی لەسەر بونیات دەنێن، نەک خودی تیۆری دڵەڕاوکێ. ئەگەر ئەم دووانە لە دەرکی خۆیان لەسەر دڵەڕاوکی خاوەن ڕاستی بن، لەو شتەیدا وا فرۆید بەشوێنیەوەیەتی، سەرکەوتوون: پەیداکردنی ئایدیا ئەبستراکتە ڕاستەکان.

**ناخۆشیی دڵەڕاوکێ**

هەموو ئەو فیلسووفانەی لێرەدا ئاماژەیان پێکردن لە دڵەڕاوکێ وەک دیاردەیەکی ناخۆش، بەڵام لە هەمان کاتدا پۆزیتیڤ و بنەڕەتی دەڕوانن. دڵەڕاوکێ حاڵ و هەوایەکی بنەڕەتییە کە ڕێگای تێگەیشتن لە واقع بەو شێوەیەی هەیە لە تێکهەڵچوونێکی ڕاستگۆیانەدا نیشاندەدا. تەنیا لە کاتی دڵەڕاوکێدایە ئێمە ڕاستەقینەین و ئەو کەسەین وا لە ڕاستیدا هەین. بەڵام بۆ دڵەڕاوکێ ئەوەندە ناخۆشە؟ ئێمە لە چی دەترسین، داخۆ لەبەر ئەوەی دڵەڕاوکی تێکەڵە بە هەستێک کە وەک ترس دەنوێنێ و، بۆیە زۆرجار لەگەڵ ترس جێگای خۆی دەگۆڕێتەوە؟

شیرکەگۆرد لێرەدا وەڵامێکمان دەداتەوە و دەڵێ: دڵەڕاوکێ ترسە لەوەی مرۆڤ حەزێکی زۆری لێیە. ئێمە '"بەتووش سەرەگێژەوە دەبین" بەرامبەر دەرفەتەکان، چونکە هاوکات هەم لێیان دەترسین و هەم پێیان سەرسام دەبین. لە بێنەوبەرەی نێوان ئەم دووانەدا ئێمە دەگوشرێین. داخۆ وەڵامی شیرکەگۆرد کەڵکی بۆ هایدگێر هەیە؟ دەستبەجێ بیردەکەینەوە لەبەرئەوەی دەرفەتەکان دەتوانن هەم ترسناک بن و هەم جێی سەرنج دەبێ خاوەن

ناوەڕۆکێک بن، دەبێ خاوەن مانایەکی تایبەت بن، هەر بەو شێوەیەی لە نموونەی بەرزاییەکەدا باسمان لێکرد و تێیدا هەست بە سەرەگێژە دەکەین. ئەگەر لەم هەستە وەک ترس بڕوانین بۆ شتێک کە پێی سەرسامین، ترسی سەر بەرزاییەکە لەسەر ئەو زانیارییە چێدەبێ کە داخۆ لەدووای ئەوەی بکەوینە خوارەوە چیمان بەسەردێت. سەرسامبوونی ئێمە کاتێک لەسەر ئەو بەرزاییە رادەوەستین چییە؟ ئێمە دەتوانین بیر لە شادییەکی خۆبخۆ بکەینەوە کە بەهۆی سووڕانەوەی ئازادانە لە حەوادا و بە هۆی سەیرکردنی مەنزەرەکانەوە تیامانا پێکدێ، شادییەک کە ئێمە بەهۆی ئاشنایی لەگەڵ هەندێ وەرزشی وەک خۆهەڵدان لە فڕۆکە و شاخەوانییەوە و هتد لێیان شارەزاین. بەڵام ئێمە دەتوانین شتێکی هاوشێوەی ئەمە سەبارەت بە 'بوونی'ی میتافیزیکیی هایدگێر ببینینەوە؟ وەڵامی هایدگێر بۆ ئەمە پۆزیتیڤە. بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ بوون هەم ترسناکە و هەم سەرنجڕاکێش. ئێمە دەزانین ئێمە بە بوون سەرسامین، چونکە ئەوە ئەمەیە کە بنەمای هەموو بەشوێنداچوون و زانیارییەکانی ئێمەیە. بەڵام هاوکات ترسناکیشە چونکە لەم رووبەڕووبوونەوەدایە ئێمە ئەرکی ئەوەی کە هەین دەکەوێتە سەرشانمان، واتە ئەو شتەی کە بەڕاستی هەین.

**فۆرمەکانی دڵەڕاوکێ، ئازارەکانی دڵەڕاوکێ**

دڵەڕاوکی بە گەلێک شێواز خۆی دەنوێنێ و، لێرەدا هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی زیاتر کۆنکرێتی ئەو چەمکگەلە بەکارببەین وا فیلسووفە وجوودییەکان پێمانی دەدەن بۆ ئەوەی لە جیاوازییەکانی فۆرمەکانی دڵەڕاوکێ بگەین.

سەرەتا بە چەمکی سارتێریی 'ئێگۆ' دەستپێدەکەین. دەتوانی بڵێین ئێگۆ خاڵی ناسینی وشیاری یاخود خودە. لەبەرئەوەی وشیاریی من بۆخۆی خاوەنی زات نیە، ناتوانێ خۆی بکا بە باتەت بۆ بیر بە بێ چێکردنی "وێنەیەک لەخۆ"، وێنایەک لەسەر من "کێ"م، یاخود بەشێوەی وردتر من "چۆن" هەم. ئەم وێنایە لە سەردەمی منداڵییەوە لە رێگای پێوەندی لەگەڵ کەسانی ترەوە شکڵ دەگرێ و دەبێ بە وێنایەکی جێگیر و مەحکەم، ئەگەرچی گۆڕانیشی بەسەردادێت. ئەم وێنایە ئیگۆیە. بەڵام ئیگۆ زیاترە لە وێنەیەک کە من لەخۆمم هەیە، ئیگۆ

هەروەها ناوەندێکە بۆ کردەکانی من. ئیگۆ پڕۆژەیەکە، شێوازێک کە من هەوڵدەدەم ببم. بە واتایەکی تر ئێمە بەو شێوەیەی دەژین کە بتوانین ئەم وێنەیە لەخۆمان بەهێزبکەین، چونکە ئەم وێنەیەیە هەستی راستەقینەبوون بە ئێمە دەبەخشێ، هەستی بوونێکی دیاریکراو. وشیاریی ئازاد کە بنەمای سوبیەکتە خاوەن هەندێ لایەنی ناڕوون و پێش بینی نەکراوەو، هەموو ئەو کردانەی تێکڕا کەسایەتی ئێمە پێکدێنن و لە رابردووی ئێمەدا هەن، بەگوێرەی ئەم وشیارییە ئازادە سەرلەنوێ شکڵی پێدەدەینەوە.

کاتێک شیرکەگۆرد سەبارەت بە دڵەڕاوکێ دەڵێ "نەفرەتێکی دڵسوزانە و دڵسۆزییەکی نەفرەتاوییە" یاخود "مەیل بە شتێکە کەسەکە لێی دەترسێ" ئەمە خۆی لە جیهانی چەمکەکانی سارتێردا دەبینێتەوە، واتە لە پێوەندیی نێوان خۆبەخۆبوونی وشیاریی، خود و ئیگۆدا. چونکە خود خاوەن حەز و ئامانجە. وە هەندێ لەمانە دەمانترسێنن نەک لەبەر ئەوەی خەتەرن، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەڕەشە لە ئیگۆ دەکەن و بۆیە ئەو هەستەمان پێدەبەخشن کە راستەقینەن. ئەمە هەڕەشە لە ئیگۆ دەکا لەبەر ئەوەی دەتوانێ لە کیشەدا بێت لەگەڵ ئەو وێنایەی من لە خۆمم هەیە. ئەمە وەک خاڵێکی لاواز لە کۆنترۆڵی خۆدا خۆی دەنوێنێ، وەک نەبوونی شوێن پێیەکی بەهێز.

ئەم پێوەندییەی نێوان حەز و دڵەڕاوکێ دەبێتە هۆکاری ئەوەی دڵەڕاوکێ لای شیرکەگۆرد و دوواتر لەسەردەمی فرۆید گرێ بدرێتەوە بە سێکسواڵیتەوە، بەتایبەت لەلای ژنان. هەروەها لەلای زۆریەک لە پیاوانیش لەهەمان سەردەمدا وەفادارییی جنسی بایەخێکی گرینگ بوو و، حەزە جنسییەکانیان دەتوانرا خەتەر بن، بەڵام هەڕەشەی لە ئیگۆی ئەوان (واتە لە وێنای خۆیان لەسەر خۆیان) نەدەکرد. ئەوەیکە پیاوێکی وەفادار حەزی لە ژنی تر بوو، خۆی لەبەر چاوی خۆیدا بچووک نەدەکردەوە، رەنگە بە پێچەوانەیشەوە بوو؛ واتە ئەمە هەستی پیاوەتیشی لا بەهێزتر دەکرد. پیاو دەبا کۆنترۆڵی حەزی خۆی بکا، بەڵام هاوکاتیش هەستی بەلەخۆبایی بوون دەکرد. لەلایەکی ترەوە بۆ ژنی وەفادار، هەبوونی حەزێکی لەم چەشنە ئەوەی دەکرد بە سۆزانی یاخود ژنێکی 'هەرزان'، شتێک کە ئەو یەکجار رقی لێی بوو. ئەو پیاوانەی کەڵکیان

لەم حەزەی ژن وەردەگرت و لەگەڵیانا دەنووستن، کەچی هەر لەو کاتەدا رقیان لێیان بوو. بۆیە وێنای ژنان لە خۆیان (ئیگۆ) دەکەوتە مەترسییەوە و، ئەمە بەواتای دڵەڕاوکێیە.

لەژێر دڵەڕاوکێدا حەزە خۆی حەشارداوە. حەزێک کە من ناوێرم دانی پیانێم لەبەر ئەوەی من دەکا بە شتێکی تر لەوەی هەم. رەنگە پێویست نەکا حەزەکە زۆر بەهێز بێت، هەر ئەوەندە بەسە مرۆڤ هەست بە دەرفەتێکی تر بکا و، خود خۆی لەناویدا ببینێتەوە، چونکە ئیگۆ وەک چوارچێوەیەکی بەرتەسک و داخراو هەستی پێدەکرێ. لە دۆخە دژوارەکاندا ئەم حەزە قبوڵنەکراوانە دەتوانن زۆر روون و دیاربن، بۆ وێنە ئێمە حەزدەکەین بکوژین، بقیژێنین و هتد. لێرەدا دەتوانین بە هێنانەوەی نموونەی ژوورێک جوانتر مەسەلەکە شیبکەینەوە. بەشیوەی ئاسایی ئێمە خۆمان لە ژوورێکدا دەبینینەوە کە تێیدا راحەتین، بەڵام گەر کتوپڕ هەست بەوە بکەین تێیدا زیندانی کراوین، هەر ئەو ژوورە ئارامەمان لێدەبێ بە شتێکی ترسناک و هەوڵدەدەین هەرچی زووتر خۆمانی لێدەربازبکەین. هەر بەو شێوەیە ئیگۆی ئێمە دەتوانرێ وەک ژوورێکی ئاشنا بێت کە ئێمە تێیدا هەست بە ئارامی دەکەین، یاخود ببێ بە زیندانێکی ترسناک کە دەمانەوێ لێی دەربازبین.

دڵەڕاوکێ بریتییە لە ترس لە حەز و هەر لەوکاتەدا راگرتنی. لە دڵەڕاوکێدا ئێمە بە واتای تەواوی کەلیمە لەژێر گوشارداین، چونکە بە شێوەی فیزیۆلۆژی وەک چۆن لە فۆرمولی 'فریتز پێرلز' باسی لێدەکرێ، خۆی نیشاندەدا: "دڵەڕاوکێ بریتییە لە هەستی هەڵچووی ئێمە بە بێ هەناسەمان." دڵەڕاوکێ بریتییە لە هەڵچوونی جەستە و راگرتنی هەناسە پێکەوە. راگرتنی هەناسە کردارێکی جەستەییە بەرامبەر راگرتنی هێزی حەز. ئەمە وەک 'کێشەی هەناسەکیشان'یش هەم باسی لێدەکرێ و هەم ئەزموندەکرێ، چونکە ئێمە نازانین کە خۆمان هۆکاری ئەمەین. دڵەراوکێ دەبێتە هۆکاری لێدانی زیاتری دڵ، بەرزبوونەوەی زەختی خوێن و نیشانە جەستەییەکانی تری هەڵچوون.

ئێمە ئاشنای ئەم نیشانە جەستەییانەی دڵەڕاوکێین و، ئەوان دەتوانن ببنە سەرچاوەی 'دڵەڕاوکێی دووهەم'، واتە ترس لە دۆخی دڵەڕاوکێی جەستەیی.

مرۆڤ دەتوانێ بە بێ ئیگۆ بژی یان نا، پرسیارێکی قووڵ و سەرنجڕاکێشە. ڕەنگە ئەمە دەستنەدا، ڕەنگە بۆ ئەوەی بتوانین ڕێگای خۆمان لە جیهاندا پەیدابکەین تەواو پێویستە بوونی خۆمان بەدەوری ئیگۆدا چێبکەین. بەڵام بەهەرحاڵ لەوە دڵنیاین کە لە دوواجاردا ئەوە ستراتیژی ژیانە ئاساییە. بەڵام ئەم ستراتیژە لەبەر ئەوەی دەربڕی وەهمێکی بنەڕەتییە، دەبێ لەپێناویا شت بدەین. ئێمە لەگەڵ ئەوەی دەزانین وانیە، بەڵام لامان وایە کەمتر لەوەی هەین خاوەن ئازادیین. باوەڕ بەمەدەکەین، چونکە دەمانەوێ باوەڕی پێبکەین. مرۆڤ تواناکان و سەرچاوەکانی خۆی بۆ چێکردن و بەردەوامی بەخشین بە ئیگۆ بەکاردێنێ، ئیگۆ وەک سترۆکتۆرێکی نەگۆڕی کەسایەتی کە بەردەوام وەک وەهم دەمێنێتەوە. کاتێک سارتێر دەڵی مرۆڤ بریتییە لە مەیلێکی بێهوودە هەر مەبەستی ئەمەیە، یان بە شێوەیەکی باشتر بیڵێین: هەوڵێکی بێهوودە.

ئیگۆ هەروەها سیستمێکە لە ئایدیاکان و، لە ئەزموونەکانی رابردوو کە بە شێویەکی تایبەت تەفسیردەکرێن، هەروەها سیستمێکە لە پرۆژەکرداریيە ناوشیارییەکان. ئەم سیستمە دەتوانێ: یەکەم، کەم تا زۆر کاتێک ئێمە خۆمان بەکەم دەگرین و مانایەک لەسەر خۆمان نابینینەوە، بەربەژیان بگرێ؛ دووهەم، کەم تا زۆر کفایەت دەکا، کەمتر کفایەت دەکا کاتێک حەز، ئاوات و ئامانجەکانمان لە ئاستێکی کەمدا لەگەڵ ئەو کەسایەتییە دێنەوە وا ئێمە سەبارەت بەخۆمان هەمانە؛ سێهەم، کەم تا زۆر سەختگیرە، سەختگیرترن کاتێک لەسەر بنەمای کردارە دووپاتکراوە و قایمترەکان چێکرابن وەها کە هەتا لەگەڵ کەسایەتی ئێمەدا نەکەونە کێشەوە کەمتر هەست بە کەم و کورتیان دەکەین.

ئیگۆ سیستمێکی سەرچاوەیە و بەگوێرەی ڕێگای خۆمان دیاریدەکەین. ئەگەر من خۆم وەک کەسێکی لاواز، بێ پەنا و ترسنۆک هەست پێبکەم، دونیا لەبەر چاوم بەهێز و پڕ لەهەڕەشە دەنوێنێ. ئەگەر من خۆم وەک کەسێکی چالاک و داهێنەر ببینم جیهان بۆ من دەبێ بە دەرفەت و بە ڕێگرەکان. ئێمە جیهانی دەورووبەری خۆمان وەک بینایەک دەبینین کە لەسەر ئەم سیستمە چێکراوە. کەسی لاواز و ترسنۆک ڕەنگە هاوڕێیەکی یەرمەرتیدەر پەیدا بکا، لە خانوویەکدا دوور لە دراوسێکانی بژیت و کارێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە بە بەرپرسایەتی و

ریسکی کەمترەوە. کەسی سەرقاڵ تۆڕێک لە هاوڕێ بە دەوری خۆیدا دروستدەکا کە دەتوانێ یارمەتیان بدا، ئۆتۆمبیلێکی کۆنی هەبێ بۆ تەعمیرکردن و، دۆخێک بۆ خۆی چێ بکا کە هەست بکا تێیدا دەتوانێ زۆر شت راستبکاتەوە. کەسی لاواز دەتوانێ لەخۆی وێنایەک دروستبکا وەک کەسێکی بەردەوام شکست خواردوو لە کارەکانیدا، یاخود وەک کەسێک لە خۆی بڕوانێ کە لەلایەن کەسانی ترەوە گوشاری سەردەخرێ و هەر ئەوانیش بە هۆکاری شکستی خۆی دەزانێ. جاروبار دەتوانێ وەهایش بێت کە کەسی لاواز بەشوێن ئەو دۆخە لاوازانەویە بۆ ئەوەی مۆرکی لاوازیی خۆی تیا دەستەبەربکا. کەسی لەڕادەبەدەر خۆبەگرینگ زانیش دەتوانێ ببێ بە بەڕێوەبەری ئۆرگانێک، یاخود دەوڵەتێک کە ئەمەیش بەمانای پەرەسەندنی ئیگۆکەیەتی. کەسی دیکتاتۆر لە خەڵکی وەک موڵکی شەخسیی خۆی دەڕوانێ و، لەگەڵ ئەو خەڵکەی بە هی خۆی دەزانێ هەست بە ئازار و سەرکەوتن دەکا. سارتێر دەڵێ چونکە خانووەکە قورسە قورسایی دەبەخشێتە خاوەنەکەی. بۆیە ئیگۆ لەناو ئەو دۆخی ژیانەی کەسەکە بۆخۆی دروستیدەکا، بەهێزتر دەبێتەوە.

کاتێک ئیگۆ لە لایەن بونیاتی خۆبەخۆی ئێمە دەکەوێتە بەرهەڕەشە، بەشێوەی بەردەوام لە دونیای دەورووبەرماندا لەدووی ئەو شوێنە مەحکەمانەیە وا دەتوانین دەستیان پێوەبگرین. ئەمە دەتوانێ لە شێوازی ئەو کردارە زۆر دووپاتکراوانە بێت کە خۆیان لە فۆڕمی کردەی زۆرەملیدا نیشاندەدەن. بەڵام دەتوانێ لە شێوازی نیازێکی بەهێز بۆ شوێنە تایبەتییەکانیش خۆیان نیشان بدەن. بەپێچەوانەوە مرۆڤ لەو دۆخانەدا هەست بە دڵەڕاوکێ دەکا کە کەمتر یارمەتیی دەرەکی بەردەکەوێ و، مرۆڤ هەوڵدەدا خۆی لەوەها دۆخگەلێک بپارێزێ، بۆ وێنە لە فوبیادا. لە پێوەندیی ئاڵۆزی نێوان خۆبەخۆیی دەروونی، ستروکتوری ئیگۆی هەر مرۆڤێک و سەرچاوە دەرەکییەکانی ئیگۆدایە کە نیشانە تایبەت و بەڕواڵەت تەواو ئاقڵانەکانی دڵەڕاوکێ دەتوانن دەرکەون.

لەم کایە دوولایەنەی نێوان ئیگۆ و دەورووبەر، شتە دەرەکییەکان بە شێوەی سەربەخۆ لە کارکردیان، بایەخە سیمولییەکان وەردەگرن. جل و بەرگ، خانوو و ئۆتۆمبیل ئەو شتانەن

زۆربەی کات خاوەن توانایەکی سیمبولیانەی بەهێزن. ئەو مرۆڤەی کاری باشی خۆی لەدەستدەدا و داهاتی دادەبەزێ، رەنگە ئەمە شکستێکی گەورەبێ بۆی کە ئۆتۆمبیلێکی هەرزانتر بکڕێ ئەگەرچی هەر ئەم ئۆتۆمبیلەیش بەهەمان شێوازی ئۆتۆمبیلەکەی پێشوو دەتوانێ نیازی ئەو بۆ هاتووچۆ دابین بکات. خانوویەکی گەورە دانیپیانانی هەندێ ئیگۆیە؛ وەها خانوویەک نیشاندەری ئاسایش، خۆشگوزەرانی و دابینبوونە. بەڵام بۆ هەندێ کەسی تر کە بۆ وێنە وێنای خۆی لەسەر هاووڵاتیبوونی جیهانی دامەزراندووە، واتە کەسێک کە زۆر سەفەردەکا و کەمتر خۆی بە کۆمەڵگایەکی لوکاڵییەوە گرێداوە، هەبوونی وەها خانوویەک دەتوانێ شتێکی باش نەبێ چونکە لە دەرفەتی ئەو بۆ گەڕان دادەبەزێنی. یان رەنگە مرۆڤ ئەگەرچی لیستێکی لە شتە دڵخوازەکانی تر هەیە، بەڵام دەبێ داوای لێبوردنیش بکا لەسەر ئەوەی خاوەنی زۆر شتیشە. بۆ زۆر گەنجی ئەم سەردەمە هەبوونی موبایل بەمانای قورسایی بەخشینە بە کەسایەتییان، چونکە وەها ئامرازێک پێوەندییان بۆ چێدەکا.

ئێمە ئەوەین وا لە چاوی خەڵکی تردا هەین. لە سەردەمی منداڵییەوە ئەوە روانینی خەڵکی ترە وێنای ئێمە لەسەر خۆمان دروستدەکا، دیارە بە خوێندنەوەی تایبەت بە خۆمانەوە. بۆ نموونە خوێندنەوەی خۆمان دیاری دەکا کام کەسانە لەدەرەوەی ئێمە خاوەن مانان. ئێمە زۆر خێرا دەگەینە ئەو تەمەنەی قسەباشەکانی ئەو کەسانەی وا بە هەندیان وەرناگرین و لامان گرینگیان نیە، رەدبکەینەوە.

کاتێک خودی سیمبولە دەرەکییەکانی ئێمە لە کاردانەوە لە دژی پەیمانە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو کەسانەی لەدژیانین دروستدەبن، دەکەوینە پەیوەندیی لەگەڵیان. چونکە ئێمە گرفتاردەبین لە کایەیەکی دوولایەنەی ئاڵۆز لەگەڵ کۆمەڵگای دەورووبەرماندا، کایەیەک کە کۆنترۆڵێکی تەواومان بەسەریدا نیە؛ هەروەها ئایدیا و نمونەی کۆمەڵایەتیش هەن کە دەبنە هۆی دڵەڕاوکێ.

**نموونەکان**

نموونەکان لە ژیانی ڕۆژانەدا: (١) نموونەیەک بریتییە لە لێدانی دڵ کاتێک زۆربەی خەڵک لە دەرگایەک دەدەن. لێرەدا مرۆڤ دۆخێکی کراوە و نادڵنیای خوڵقاندووە و، دەبێ دەرەقەتی بێت. لە پشت لێدانی دەرگا حەزی گەیشتن بە شتێک واتە مەبەستێک ڕاوەستاوە. ئەم نادڵنیاییە دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ نەتوانێ وەک دۆخی ئاسایی پێش بینی خۆی بکا ـ ئەوەی کە چلۆن دەتوانێ بەرەوڕووی دۆخەکە بێتەوە و بەسەریدا زاڵبێ. بەڵام هەر کە گفتوگۆکە دەستپێدەکا دڵەڕاوکێکە کەمدەبێتەوە، لەبەر ئەوەی مرۆ هەستدەکا "گەیشتووەتە" پێوەندێکی گفتوگۆیانە و، ئیدی دۆخەکە پێش بینی کراوەو خراوەتە ژێر کۆنترۆڵەوە. (٢) نموونەیەکی تر دەتوانێ تاقیکاری ئەعساب بێ لەکاتی تاقیکاریدا و بەم هۆیەوە کەسەکە وەها سڕدەبێ کە چیتر ناتوانێ لەسەر بابەتەکە خۆی کۆبکاتەوە. دیارە ئەمە دەتوانێ جیاواز بێت لەوەی کە داخۆ کەسەکە هۆکارێکی ڕاستەقینەی بۆ ترس هەیە یان نا. ئێمە دەتوانین بە شێوەی ئاقڵانە بیر لەوە بکەینەوە کەسەکە خاوەن زانیاریی پێویستە (یاخود خاوەن زانیاریی پێویست نیە) و، ئاکامی تاقیکارییەکە لەراستیدا پێوەندی بەم تواناوە هەیە. ئەرکی کەسەکە ئەوەیە کەڵک لە زانیارییەکانی خۆی وەربگرێ و وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە. بەڵام بە کردەوە دەزانین لێرەدا فەزایەکی گەورە بۆ ئازادی هەیە. مرۆڤ دەبێ لە پرسیارەکان بگا، لێکیانبداتەوە و بەشێوەی دروست وەڵامەکان ڕێکبخات. ئەوسا دەرفەتە خۆبەخۆکان دەردەکەون ـ داخۆ دەترسم یان نا؟ لێرەدا شوێن بۆ دڵەڕاوکێ هەیە و، بێگومان دەرفەت هەیە بۆ دڵەڕاوکێیەکی تر کە بریتییە لە ترس ڕێک لە کاتی تاقیکراییەکەدا، ترس لەوەی کە داخۆ دەتوانم دەرەقەتی تاقیکاری لەبواری ئەعسابی خۆمدا بێم یان نا. داخۆ دەتوانم بەسەر ئەم دڵەڕاوکێیەدا زاڵ بم یان نا. (٣) ئەگەرچی مرۆڤ خاوەن فوبیای ڕاستەوخۆ نیە، بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان خاوەن هەندی بوارن کە خۆیانی لێدەبوێرن چونکە ئەم بوارانە (یاخود شوێنانە) لەگەڵ خۆیان دڵەڕاوکێ دێنن. مرۆڤ لەجیاتی ئەوەی زەنگبدات نامە دەنووسێ، چونکە لای وایە زەنگلێدان وەک کوتانی دەرگاکە دڵەڕاوکێ دێنێ. یاخود زەنگلێدانەکە دوادەخا. مرۆڤ ئۆتۆمبیلەکەی خۆی لای شرکەتێک بە نرخێکی کەمتر دەفرۆشێ بۆ ئەوەی خۆی لە دڵەڕاوکێی مامەڵەکردن

لەگەڵ خەڵکی بپارێزێ. مرۆڤ خۆی لە گۆڕینی کار، گواستنەوە یاخود جیابوونەوە لە هاوسەرەکەی سەرەڕای دۆخی نالەباری ژیانی دەپارێزێ، چونکە ئەمانە لەگەڵ خۆیان دڵەراوکێ دێنن. زۆرکەس ژیانی هاوبەشی ناخۆشی خۆیان پاراستووە بەس لەبەر خۆپاراستن لە دڵەڕاوکێی جیابوونەوە. ئەمە دەتوانێ ترسناک بێت لەبەر ئەوە مرۆڤ دەبێ بە پێوەندی خۆی لەگەڵ ئەو کەسەدا بچێتەوە کە لێی دەترسێ و خاڵە لاوازەکانی ئەم دەناسێ. زۆربەی هاوڕێیەتییەکان و خۆشەویستیەکان لەسەر خۆپاراستن لە دڵەراوکێ راوەستاون. لە کاتێکدا چاوپێکەوتنی نێوان کچان و کوڕان دەتوانێ ئاسانتر هۆکاری دڵەڕاوکێ بێ.

نموونە: دڵەڕاوکێی ترسی لەرادەبەدەر. کەسێک بە ناوی 'ئا' خاوەن دۆخ و ناووناوبانگ و داهاتێکی باشە. ئەم کەسە تەنیایە، بەڵام هەستدەکا لەبواری پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا کێشەی نیە. 'ئا' دەتوانێ کاسبکارێکی خاوەن شرکەتێک بێت کە وەرشکست دەبێ، یاخود مرۆڤێک بێت خاوەن پێگەی گرینگی بەڕێوەبەری و کارەکەی لەدەستدەدا. 'ئا' لێرەدا دۆخەکەی دەگۆڕدرێ و ئەو پێگەی جارانی نامێنێ و دەبێ بە کەسێکی بێکاری بێ داهات. بۆیە هەموو ئەو سەرچاوانەی ئەو بە دەوری خۆیدا بۆ پێگەیاندنی کەسایەتی خۆی دروستی کردبوون، دەڕوخێن. ئیستا لە راستیدا ئەو کێیە؟ لە پێوەندی لەگەڵ ژناندا ئەم کێشەیە تایبەتیترە. 'ئا' دەبینێ گەر روو بکاتە ژنان بۆ ئەوەی پێوەنێک درووست بکات، هەر کە ژنەکان دەزانن ئەو کار و داهاتی نیە و وەرشکست بووە، دەستبەجێ لێی دەتەکێنەوە. لێرەدا 'ئا' بەتووش دڵەراوکێی ترسی لەڕادەبەدەرەوە دەبێ. ئەو قەت لەپێش لەدەستدانی کارەکەی وەها شتێکی ئەزموون نەکردبوو. دڵەڕاوکێ هەروەها لەو دۆخانەدا سەرهەڵدەدا کە هەستی کەسایەتی دەکەوێتە مەترسییەوە. حەزی جنسی دەتوانێ یەکێک لەو هۆکارانە بێت.

نموونە: ئاگۆرافۆبی. نموونەیەکی تر دەتوانێ ئاگۆرافۆبی بێت کە گرێدەخواتەوە بە دڵەڕاوکێ بۆ شوێنە کراوە یاخود داخراوەکان. شوێن دەتوانێ بەئاسانی هۆکاری دڵەڕاوکێ هەبێت، چونکە شوێن خۆی لە خۆیدا 'هیچ' (یاخود 'نەبوون'ێکی) فیزیکییە و، مەرجێکی فیزیکیشە بۆ ئازادی، دیسان لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێویستی بە شوێنە بۆ ئەوەی بتوانێ ئازادانە تیایا بجوڵێ.

بنەڕەتیترین سەرچاوە دەرەکییەکانی ئێمە پێوەندییان بەو ئاراستانەوە هەیە وا لە ناو شوێندان. ئێمە خاوەن شوێنێکی راوەستانی قایمین لە ژێر قاچەکانماندا کاتێک لەسەر زەوی راوەستاوین، زەوی و هێزی راکێشانی زەوی لەوێن. لە سەرووی رووبەری زەوی و لەو دیمەنەی ئێمە لە رووبەڕووی خۆماندا هەمانە، شوێنی خاڵی خۆیمان بۆ دەکاتەوە، ئەو شوێنەی ئێمە دەتوانین تیایا بزوێین. ئەمانە ئەو پنتانەن ئێمە دەتوانین بەگوێرەیان ئاراستەی خۆمان دیاریبکەین. زەوی، بەرزاییەکان، درەختەکان، خانووەکان و هتد، سیستمێک لە سەرچاوەکانن ئێمە دەتوانین بەگوێرەیان ئاراستەی خۆمان دەستنیشان بکەین. ئەم سەرچاوانە ئەو دەرفەتەمان دەدەنێ لەبەرامبەر هەستی 'هیچیەتی' یان 'نەبوون'ی راوەستین وا شوێنی بەتاڵ پێماندەبەخشێ. ئەمە هاوکات وێنەی دەرەکیی سترۆکتۆری ئیگۆیە کە دەرفەتی جووڵەیەکی دەروونیی بیرمەندانەمان لە بەستێنی سترۆکتۆرێکی بێ جووڵەدا پێدەبەخشێ. بۆیە زەوی و شوێن خاوەن کارکردێکی سیمبولیانەن ئێمە ناتوانین خۆیان لە دەربازکەین. بۆیە بەئاسانی دەتوانین بڵێین دڵەڕاوکێ دەتوانێ پێوەندی بە دۆخی شوێنەوە هەبێ.

'ب' کە نەخۆشێکی دڵەڕاوکێیە سەبارەت بە تێپەڕینی لە شەقامێکدا باس لە ئەزموونێکی خۆی دەکا: خانووەکان... لەوەدەچوون داخرابن، وەک بڵێی هەموو پەنجەرەکان پێوەدرابن، ئەگەرچی ئەو دەیتوانی بیبینێ وەها وانیە. ئەو ئەوانی وەک قەڵاداخراوەکان دەهاتەبەرچاو. کاتێک دەیڕوانی دەڵێی خانووەکان بەسەر شەقامەکەدا خوارببوونەوە، وەها کە هێڵی نێوان بانەکانیان لە خودی ئەو شەقامەی ئەو بەسەریدا دەڕۆیشت باریکتر دەینواند. لە سەر چوارڕیانەکە بەتووش پانتاییەکی قووڵەوە دەبێ کە پانتر بوو لە مەودای شەقامەکە. ئەو دڵنیابوو لەوەی ناتوانێ لێیەوە تێپەڕێ. هەستی کرد تاقە تاقیکردنەوەیەکیش چیە ئەو بەرەو هەستێکی بەتاڵ راپێچدەکا، لایوابوو قاچەکانی یارمەتیی نادەن. لە پیش هەر شتێکدا مەوداکە بوو ئەوی دەترسان.[Rollo May s. 4]

لەم ئەزموونەدا دەتوانین سەرنجی دووشت بدەین. یەکەم، شوێنی بەتاڵ و پانتایی کراوە و ئەو دڵەڕاوکێیەی بەم هۆیەوە بەتووشیەوە دەبێ، کە بە گوێرەی تیۆری دڵەڕاوکێی وجوودیی

دەتوانین لێی تێبگەین. بەڵام هاوکات ئەوەیش سەرنجمان رادەکێشێ کە دونیای واقع لە گۆڕانێکی ناواقعیدا خۆی دەنوێنێ. وە لێرەدا 'نەخۆشییەک' لە ئەزموونەکەدا دەبینرێ. ئێمە دەبێ لەمە وەک رەنگدانەوەیەک تێبگەین، رەنگدانەوەیەکی دەرەکی لە دۆخێکی دەروونی. ئەمە لەپێوەندی لەگەڵ ئەو تیۆرەی باسمان لێکرد رەنگدانەوەی ئیگۆیەکی 'تەنگ پێهەڵچنراو' و 'داخراوە' کە ناتوانێ لە 'پانتایی کراوەی' بەردەمی خۆی بگا.

نموونە: ئەم نموونەیە لە رۆژنامەیەکی چەند ساڵ لەوەپێش وەرگیراوە کە تێیدا قوتابییەک بە ناو و وێنەی خۆیەوە باس لە دڵەڕاوکێی خۆی دەکا، بەڵام لێرەدا ئێمە لە ناوێکی تر کەڵک وەردەگرین و پێی دەڵێین 'ئینگر'. ئینگر دوو ساڵ بەتووش ئەم حاڵەتەوە بوو و رۆژبەڕۆژ دڵەڕاوکێ زیاتر ئازاری دەدا. ئەو وەسفی دڵەڕاوکێی دەکرد وەک ترسێکی بەردەوام کە لە دنەدەرە خۆبەخۆییەکانەوە دەهات. ئەو لە ژنێکی پیر و سەگە تووکنەکەی دەترسا، ئەو لەوە دەترسا هەم ژنەکە و هەم سەگەکەی بکوژێ. بۆیە یەکجار لەوە دەترسا لێیان نزیک بکەوێتەوە. لە تراموادا بیری لەوە دەکردەوە ترامواکە خراپ بکا و موسافیرەکانیش بریندار. بۆیە چیتر سواری ترامو ا نەبوو، بەڵام لە جیاتی ئەمە بە پێ دەچوو بۆ زانکۆ و دوو سەعاتی دەخایاند. لە کۆتاییدا بۆ زانکۆیش نەچوو و لە ئاپارتمانەکەیدا خۆی زیندانی کرد. ئینگر دەگێڕێتەوە: "لەو دۆخانەیدا لەگەڵ کەسانی تر بووم هێرشی دڵەڕاوکێ دەستی پێدەکرد. لەسەر کلاس، لەناو ترامو ا یاخود لە ریزی بانکدا. لە ناو ریزی بانکدا دەمتوانی بلەرزم و بیرە ناخۆشەکان رووم تێبکەن. بیرم دەکردەوە بڵێی من شتێکی تر بکەم واوەتر لەوەی ژنی کارمەندی بانکەکە چاوەڕوانیم لێدەکا؟ بڵێی دەستبکەم بە قیژە و هاوار و، هێرشی بکەمەسەر؟ دەتوانرا بیرە پووچەکان رووم تێبکەن لە کاتێکدا هاوکات لەوەیش دەترسام بەتووش ترسی لەڕادەبەدەرەوە بم."

لێرە لە 'ئینگر'دا ترس لە دنەدەرێکی خۆبەخۆیی دەبینین کە لە نموونەکەی سارتێردا هەیە کاتێک باس لە ژنێکی تازە شووکردوو دەکا لەوە دەترسێ دەستبکا بە لەشفرۆشی. بەڵام بۆ ئینگر ئەوە توندوتیژییە ترسناکە نەک سێکسواڵیتە.

**دڵەڕاوکێی وجوودی**

لە تیۆری فەلسەفیی دڵەڕاوکێدا بینیوومانە دڵەڕاوکێ وەک هەست یاخود حاڵ و هەوای مانایەکی بنەڕەتییانەی وجوودی وەسفکراوە، دیارە بە شێوەیەکی ئەرێنی. دڵەڕاوکێ بەیانی جۆرێک لە خودناسییە، لە دڵەڕاوکێدا ئێمە بەتووش ئازادیی وجوودیی خۆمانەوە دەبین، لە دڵەڕاوکێدا رووبەڕووی جیهان بەو شێوەیەی هەیە دەبینەوە، واتە وەک جیهانی واقع. هەر لەو کاتەدا بینیوومانە چلۆن ستراتیژی ژیانی ئێمە بەدەوری ئیگۆی خۆماندا چێدەبێ کە ئەمیش دەتوانێ بەرەو دڵەڕاوکێیەک بڕوات کە دەربڕی ناسین نیە. ئەگەرچی دڵەڕاوکێ، لەوێدا ئیگۆ لە بەر هەڕەشەدایە، دەربڕی جۆرێک لە روونکردنەوەی ستراتیژی ژیانێکی هەڵەیە، هاوکات دەبێ بە دەربڕی خودی ئەم ستراتیژە و ئەو گێژ و وڕیەی ئەم ستراتیژە دروستیدەکا.
لەبەرئەوەی ئاراستەی ژیانمان بەدەروی ئیگۆدا چێدەبێ، بەو شێوەیەی وەسفان کرد، ئەمە بەو مانایە کاتێک ئیگۆ لێکهەڵدەوشێ ئێمە لە ئاراستەکەی خۆماندا لە پێوەندی لەگەڵ واقع تووش سەرلێشێوان دەبین. ئەمە دەبێتە هۆی دەرکی خەیاڵیی ئێمە لە واقع projeksjon و، وێنایەکی خەیاڵی لە کەسایەتی خۆمانintrojeksjon، هەروەها تێکەڵکردنی خۆبەخۆییانەی دەرەوە و دەروون، وەک چۆن 'ب' لە نموونەکەی سەرەوەدا لە کاتی دیتنی خانووەکاندا بەتووشییەوە دەبوو. جا گرینگە ئاگاداری ئەمانە بین: یەکەم، ئەوە دڵەڕاوکێ نیە دەبێتە هۆکاری ئەمە، بەڵکو ئەوە تێکچوونی ئاراستەیە دەبێتە هۆکاری دڵەڕاوکێ. دووەم، ئەوە بە تەنیا هێزی دڵەڕاوکێ نیە کە نائاساییە، بەڵکو دڵەڕاوکێی بەهێزە لەم جۆرە دۆخە شێواوانەدا خۆی دەردەخا. زۆرکەس لە فۆرمی سەرەگێژە هەست بە دڵەڕاوکێیەکی یەکجار بەهێز دەکەن کاتێک لەسەر بەرزاییەکی نە زۆر بڵیند رادەوستن، بە بێ ئەوەی ئەمە دڵەڕاوکێیەکی ئازاراوی بێت. ئەو شتەی دەبێتە هۆکاری ئەوەی دڵەڕاوکێ نەخۆشیانە بێت دۆخی نەخۆشیانەیە. دڵەڕاوکێ نیشانەیە نەک هۆکار.
کاتێک دەمانەوێ دڵەراوکێی ئاسایی و دڵەڕاوکێی ئازاراوی لێک جیابکەینەوە، دەبێ سەرنجی ئەو دۆخەی بدەین وا کەسەکە تیایا وێنای پێچەوانەی لەسەر واقع و هەروەها واقعی

دەروونی خۆی هەیە. دڵەراوکێی بەهێز وەک نیشانە کاتێک دەتوانێ دڵەڕاوکێی ئازاراوی بێت ئەگەر لە دۆخێکدا خۆی دەربخا کەسێکی ئاسایی خاوەن دڵەڕاوکێ نەبێت. بەڵام ئەمە بە تەنیایی پێوانەیەکی جێی متمانە نیە. دەزانین هەندێ کەس بەتایبەتی هەستیارن، یان روانینێکی تایبەتیان هەیە، یاخود بەشێوازی تایبەتی خۆیان لەگەڵ دۆخێک رووبەڕوودەبنەوە کە تیایاندا دڵەڕاوکێ دەبزوێنێ. پێوانەی دڵەراوکێی ئازاراوی وێنا پێچەوانەکان و ئاراستە شێواوەکانە.

بە گوێرەی تیۆری فەلسەفی ئێمە چلۆن دەتوانین رووبەڕووی دڵەڕاوکێی وجوودی بینەوە؟ پێش لەهەر شتێکدا ئێمە دەبێ فێری ئەوە بین بایەخ بۆ دڵەڕاوکێ وەک دیاردەیەکی پوزەتیڤ لە ژیاندا دابنێین. ئێمە دەتوانین فێری ئەو کردارانە بین کە لە دۆخی دڵەراوکێ دوورمان دەخەنەوە. لەزۆر شوێندا ئێمە دەتوانین دڵەڕاوکێ هەڵبژێرین بۆ ئەوەی خۆمان ئازادکەین لەو کردانەی وا گوشاردەخەنە سەرمان.

جا دەتوانین هەنگاوێک بەرەوپێش بڕۆین. ئەگەر دڵەڕاوکێ وەک بێنەوبەرەی نێوان حەز و ترس لێکبدەینەوە، ئەوجا مرۆڤ دەتوانێ باشتر زانیاری پەیدا بکا لەسەر ئەوەی حەز چیە و ترس چیە. ئەو دنەدەرە چییە وا دەبێتە هۆی ترسی ئێمە لە دۆخێکدا و، ئەوە چییە لە روودانی دەترسین؟ وەها لێکدانەوەیەک دەتوانێ ئێمە بەرەو ئیگۆیەکی کراوەتر و جێدارتر ببات کە هاوکات شوێنی زیاتر بە حەزەکانمان دەبەخشێ. هەڵبەت نەک بەو مانایەی مەجبوور بین لە هەر دۆخێکدا شوێنیان بکەوین، نا، بەڵکو بەو مانایە کە لە بایەخیان تێبگەین. حەز دەربڕی هێزی ژیان و هێزی خوڵقاندنە، بۆیە دەبێ گرینگی پێبدەین.

هێشتا دەتوانین هەنگاوێکی تر بەرەوپێش بڕۆین. ئەوەیکە داخۆ دەتوانین دڵەڕاوکێ بگۆڕین بە شتی تر یان نا. ئەگەر دڵەڕاوکێ بریتییە لە حەزی خۆپێچەرەوە، ئایا دەرفەتی ئەوە هەیە حەز لەم خۆپێچاندنەوەیە دەربازبێ و ببێ بە حەزێکی تەواو؟ ئێمە دەتوانین نموونەیەک لە خلیسکێنی هەوایی بێنینەوە. ئەوانەی ئەم خلیسکێنە دەکەن بەتووش سەرەگێژەو ترسەوە دەبن و لێرەوە بەتووش دڵەڕاوکێ. دەگوترێ باشترین شێواز بۆ ئەم خلیسکێنە ئەوەیە قۆلەکانت رابکێشی و توند بقیژێنی. ئەمە دەبێتە هۆی رەها کردنی هەناسە. ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە

دڵەڕاوکێ لەگەڵ ڕاگرتنی هەناسەدایە و ئێمە بەم کارەمان خۆمان لە دڵەڕاوکێ قوتاردەکەین. بەم شێوەیە زۆر کەس هەست بەوە دەکەن هەستی دڵەڕاوکێ دەگۆڕدرێ بۆ هەستی شادی. جا بڵێی هەر دۆخێکی دڵەڕاوکێ دۆخێکی شادیی تایبەت نەبێ؟

لێرەدا دیسان دەرفەتی زۆر بۆ بەدوواداچوون و لێکۆڵینەوە هەیە.

LITTERATUR Heidegger, M.: Væren og tid (1927). Tysk utgave: Sein und Zeit. Max Niemeyer Verlag Tübingen, 1993. Engelsk utgave: Being and Time. Blackwell Publishers, Oxford, UK, 1998. Heidegger, M.: Hva er metafysikk?(1929). Dansk utgave: Hvad er metafysikk? Det lille forlag, Frederiksberg 1994. Kierkegaard, S.: Journal JJ (1843 – 44). Søren Kierkegaards Skrifter Bd. 18, Gads forlag, København, 2001. Kierkegaard, S.: Begrebet Angest (1844). Søren Kierkegaards Skrifter Bd. 4, Gads forlag, København, 1997. Norsk utgave: Begrepet angst. Bokklubbens kulturbibliotek, 2001. Sartre, J.-P.: Ego'ets transcendens (1936). Dansk utgave: Ego'ets transcendens. Hans Reitzels forlag, 1995. Sartre J.-P.: Krigsdagbøker (1939 – 40). Engelsk utgave: War Diaries. Verso Editions, 1984. Sartre J.-P.: Væren og intet (1943). Engelsk utgave: Being and Nothingness. Routledge, London, 1993. Norske utgaver i utdrag: (1) Væren og intet. Pax forlag, 1993. (2) Erfaringer med de andre. Gyldendal, 1994.